# ڕێکخستنی یاسایی تاوانی سواڵکردن

## لە یاسایی سزای عێراقی

(( توێژینەوەیەکی یاساییە ))





نووسینی:

**دکتۆر شاکر سلێمان محمود**

چاپی یەکەم

٢٠٢٣

کتێبخانەی تەبایی
07507026021

# ڕێکخستنی یاسایی تاوانی سوالکردن
# لە یاسای سزادانی عێراقی

(توێژینەوەیەکی یاساییە)

د. شاکر سلیمان محمود

هەولێر
٢٠٢٣

# ڕێکخستنی یاسایی تاوانی سواڵکردن
# لە یاسای سزادانی عێراقی


ئامادەکردنی: د. شاکر سلێمان محمود

نەخشەسازی: پەراوگەی سروش / گارا

ئۆری چاپ: چاپی یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٢٣

چـــاپکردن: چاپخانەی هێڤی

تیـــــراژ: ٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٥٩١)ی ساڵی ٢٠٢٣ی پێدراوە.


---



---




لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی (تەبایی)

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی پەرتوکی یاسایی

ژمارەی مۆبایل : ٠٧٥٠٧٠٢٦٠٢١

# ناوەڕۆکی ئەم کتێبە

# ئەم کتێبە بۆ؟

دەرۆزەکردن دیاردەیەکی خراپ و ناشارستانی یە کە لە جیهاندا بڵاوبوویتەوە، وە بە یەکێک لە تاوانە کۆمەڵایەتییەکان هەژمار دەکرێ... و پێناسە دەکرێ بەوەی کە کەسێک داوای پارە و مایە بکات لە کەسانی دیکە، لە ڕێگا و شوێنە گشتییەکان، وەک بازار و مزگەوت، بەهۆی بەکارهێنانی ڕێگای فرت و فێڵ و هەڵخەڵەتاندن، وەک خۆپیشاندان بە تووشبوون بە نەخۆشی، و نەبوونی توانای ماددی بۆ وەرگرتنی چارەسەری پزیشکی، یاخود وون کردنی جانتای پارە و نەداری بۆ کڕینی ئاو و خواردن و شتی تر، یاخود دروست کردنی داخوازی تر کە پێویستی بە هاوکاری و پارە پێ بەخشینە، و لە زۆربەی ئەمانەش ئافرەت و منداڵی تازە لەدایک بوو، یان منداڵی کەم ئەندام، یان بە ئەنقەست دروست کردنی کەم ئەندامی جەستەیی بەکاردەهێندرێ، بۆ ڕاکێشانی بەزەیی و سۆزی خەڵک، بە مەبەستی سامان و مایەو پارە.

جێگای ئاماژە پێکردنە، ئەم دیاردەیە بە ترسناکترین نەخۆشی یە کۆمەڵایەتیەکان دادەدنرێ، کە لە کۆمەڵگای عێراقی و کوردستانی بڵاوبوویتەوە، وە کاریگەری زۆر خراپی بەسەر ناو و شورەتی کۆمەڵگا دروست کردووە کە لە پایەکەی و کەسایەتی مرۆڤی کەم کردۆتەوە.

تێبینیش کراوە، کە ئەم ژینگەیەی کە دەرۆزەکەر تیایدا دەژی، سەرتای ڕێگایەکە یاخود ڕێ خۆشکردنە بۆ بڵاوبوونەوەی هۆکارەکانی ڕوودانی تاوان، وەک تاوانی دزیکردن و بەلارێدان لە پرنسیپە گشتی یەکان، و ئالوودەبوون و بازرگانی کردن بە ماددە هۆشبەرەکان، و

تاوانی تری ئابڕووبەر وەک تاوانەکانی لەشفرۆشی و زیناکردن و دەست درێژکردنە سەر ناموس، چونکە کەسی دەرۆزەکەر بەبێ ماندووبوون و ئەزیەت کێشان پارەی بەدەست دەکەوێت، و بێ گوێ پێ دان بە خەرج کردن و بەهەدەردانی (فەوتاندنی) لە کڕین و مومارەسەکردنی شتە قەدەغەکراو و ڕێگا پێ نەدراوەکان بەکاریدەهێنێ، کە کارئاسانی بۆ زیادبوون و ڕوودانی تاوان دەکات.

سەرەڕای ئەوەی کە یاسا دانراوەکان و یاس سزاییەکانی وڵاتان، و لە نێویشاندا یاسا دانەری عێراقی ئەم کارە نەرێنەیانە بە تاوان هەژمار کردووە، و سزای یاساییان بۆ داناوە، کە لە یاسای (سزاکانی عێراقی) ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ ماددەکانی (٣٩٠-٣٩٢)ی بۆ تەرخان کردووە، کە توندترین سزای بریتی یە لە حەپس کردن بۆ ماوەی زیاتر نەبێت لە مانگێک، ئەگەر هاتوو سواڵکەرەکە هەژدە ساڵی تەواو کردبێت، کەچی زۆر گرنگە بۆ بنبڕ کردن و ڕیشەکێش کردنی ئەم دیاردەیە لە نێو کۆمەڵگادا سیمینارو کۆنفرانس و توێژینەوەی زانستی و ئەکادیمی و ووتار نووسین و ووتار خوێندن لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و ئامرازەکانی تری ڕاگەیاندن، بینراو و بیستراو، و سەنتەرەکانی زانستی و ڕۆشنبیری، و لە ڕێگای لایەنە پەیوەندارەکان وەک ئەنجوومەنی دادوەری و وەزارەتەکانی ناو و خۆ و کاروباری کۆمەڵایەتی و زانکۆکان کە لە کەسانی تایبەتمەند وەک دادوەران و ئەندامانی داواکاری گشتی و مامۆستایانی زانکۆ و ئەندامانی پۆلیس و ئاسایش و کۆمەڵناس و دەروونناسەکان بۆ ئەنجام بەرێ، بە مەبەستی ئاراستەکردنی کۆمەڵگا بۆ نەهێشتن و کە کردنەوەی ئەم دیاردە ناشارستانی یە.

و ئەم نووسینەش لەسەر تاوانی سواڵکردن و یاسای سزادانی عێراقی، کە لەلایەن دکتۆر (شاکر سلێمان مەحمود) ئەنجام دراوە، بە

زمانی شرینی کوردی لەسەر گرنگترین کاریگەر و هۆکارە کۆمەلآیەتی و ئابوورییەکانی دیاردەی سوالکردن، پەیوەندییان بە بەلاڕێدانی ڕەفتارە کۆمەلآیەتی یە کان، کە بەم دواییانە لە نێو شار و شارۆچکەکانی عێراق و هەرێمی کوردستان بلاوبوویتەوە، لەگەل دیاریکردنی ئەو هۆکارانەی کە پالی بە هاولاتیان ناوە لەسەر ئاستی نیشتمانی، بۆ گرتنەبەری ئەو ڕێگایە وەک پیشە بۆ پەیداکردنی پارە و سامان، و چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی دیاردەکە بە شێوەیەکی سزایی، و ئاستی گونجانی ڕێکخستنی یاسای سزای عێراقی لەسەر ڕێژەی تاوان و دیاردەکە، شایانی خوێندنەوە و گرنگی پێدانە و لەهەمان کات بەشداری کردنە لەلایەن نووسەر بۆ دەولەمەندکردنی پەرتووکخانەی یاسای لە کوردستان و زیادکردنی سەرچاوەکان بەزمانی شیرینی کوردی.

دادوەر

**ئازاد حەیدەر باوە**

ئەندامی دادگای تاوانەکانی هەولێر /١

٢٠٢٣/٨/٢٠

# پێشەکی

دیاردەی سواڵکردن لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکانە کاریگەری نەرێنی لەسەر کۆمەڵگە هەیە، بەتایبەت لەم دواییانەدا ئەم دیاردەیە زۆر پەرەی سەندووە وهەڕەشە لە ئاسایش و سەقامگیری کۆمەڵگە دەکات و دواتر دەبێتە کێشەیەکی گەورە و بەربڵاو کە پێویست بە بەرگەلێگرتنی دەکات و دەبێت چارەسەر بکرێت، بەتایبەت ئێستا بووەتە پشتێنەیەکی جیهانی فراوان و چەندین شێوازی پێشکەوتووی هەیە و جۆرە وشێوەکانی جیاوازە ، کە دەستە و چینەکانیان جۆراوجۆرن، لەمرۆدا تەنها بێ پارە و بێکارەکان سواڵ ناکەن تەنانەت کەسانێک ئالودەی سواڵکردن بوون کە پیشەی بەرزیان هەیە و لە پشتەوە قازانج دەکەن، سەرباری ئەوەی یاسا چەند دەق و بنەمایەکی یاسایی سزایی ڕیزبەند کردووە لەسەر هەر کردارێک کە یاسا بە تاوان ئەژماری کردوون و سزایەکی تاوانکاری بۆ دیاری کردوون ، بە سزادان بێت یان ڕێوشوێنی خۆپارێزی و،بەرپرسیارێتی سزایی ڕوودانی تاوانەکە دەسەپێنێ و پایەکانی تەواو دەکات و مەودای مەترسیداربوونی تاوانەکە دیاری دەکات و لەگەڵ ئەوەشدا چەندین تاوان هەیە سزاکەیان لەکۆتاییدا دەبێتە ڕێگری گشتی و تایبەتی کە ئەم تاوانە تا ئێستاش هەر مەترسیدارە و هەڕەشە لە ئاسایش و سەقامگیری کۆمەڵگاکان دەکات بەدرێژایی سەردەمەکان.

تاوانی سواڵکردن یەکێکە لەو تاوانە کۆمەڵایەتیانەی کە سەلیقەی گشتی دەشێوێنێ، بەهۆی ئەوەی سواڵکردن کاریگەری زیانگەیاندن و ئازاردانی هەستی خەڵک و بێزارکردنیان دەنێتەوە، ئەمەش کەرامەتی مرۆڤ هەم بەفیڕۆ دەدات و هەمیش کەم دەکاتەوە. بارودۆخی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و کلتوریی ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕن لە بڵاوکردنەوەی ئەم دیاردەیە، کە بەڕوونی دیارە بەشێک لە سواڵکەرەکان لەلایەن باندە تاوانکارەکانەوە کۆنترۆڵ و بەڕێوە دەبرێن، بۆ بەدەستهێنانی پارە، ئەم باندانە منداڵ و ئافرەتان بۆ وروژاندنی

سـۆزی خەڵـک بەکـاردەهێنن. لێـرەوە بۆمـان دەرکەوت، کە تـاوانی سـواڵکردن تـاوانێکی بە ئەنقەسـتە، تەنـانەت ئەم تـاوانە پێویسـتی بە پەیوەندی هۆکاریی لە نێوان کردارەکە و ئەنجامی تاوانکارییەکە نییە، بە خودی ئەنجامدانی ڕەفتـارەکە، تـاوانەکە و تاوانبـارییەکە بەدی دێن. ئەم تـاوانە بە پێـی یاسـاکانی عێـراق بە پێشـێلکاری دادەنرێـت. یاسـادانەر دۆسیەی سواڵکردنی بە تاوان نەزانیوە، زۆربەی سـواڵکەرەکان کاتێک لە ڕێگـا گشـتیەکان یـان لە شـوێنە گشـتیەکانن لە ڕێـگەی فرۆشـتنی کلینکس یـان مـادەی پاککردنەوەی جـامی ئۆتۆمبێلەکـان یـان فرۆشـتنی کاڵای بێ بەها پارە کۆدەکەنەوە، ئەمەش هیچ نییە جگە لە بیـانووییەک بۆ بەدەستهێنانی پارە بە مەبەستی سـواڵکردن نەک کـارکردن، ئەمەش وایکـردووە، ژمـارەیەکی زۆری سـواڵکەر لە سـزاکە ڕزگاریـان بێـت. یاسادانەر دۆخی دووبارە گەڕانەوە بۆ سواڵکردنی پشتگوێ نەخستووە، دوای دەسـتگیرکردن و ڕەوانەکردنـی بـۆ دامەزراوەکـانی سـزادان یـان دامەزراوە چارەسەرییەکان کردووە، بۆ مەبەستی چارەسـەرکردن و بۆ دوورکەوتنەوە لە پەیوەنـدیکردن لەگەڵ تاوانبـاران. هەروەهـا یاسـادانەر سـەرکەوتوو نەبـوو لە مـادەی ٢/٣٩٠ ، کاتێـک بڕگەکـانی مـادەی ٧٢ی یاسای چـاودێری نەوجەوانـان بەژمـارە ٧٣ سـاڵی ١٩٨٣ی هەمـوارکراو، سـەبارەت بە سـواڵکردنی نەوجەوان جێبەجێ کـرد، چـونکە سـواڵکردنی نەوجەوان پێویستی بە پاراستن و چـاودێری هەیە ، ئەگەر نەوجەوانەکە سواڵکردن ئەنجـام بـدات و ئەمەش دژایەتیی لەگەڵ مەرجەکـانی یاسـای چاودێری نەوجەوانان دروستکرد.

هەروەها ئاماژە بە میکانیزمی چارەسەری نێودەوڵەتی دەکەین، کە لە زۆرێک لە پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان و نامەکانی دەستووری وڵاتان پێکهـاتووە، ئەوانەی داوای ڕێزگـرتن لە کەرامەتـی مرۆڤـایەتی و دابینکردنـی کـارێکی گونجـاو و ژیـانی باشـیان بـۆ دەکەن. هەروەهـا باسمان لە ڕۆڵی هەریەکەیان لە وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی و وەزارەتـی نـاوخۆ کـرد، لە گـرتنەبەری ئەو ڕێکـارانەی، کە ڕۆڵـی گەورەیان هەبوو لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەیسەکانی دیاردەی سواڵکردن بە تایبەتی یاسای پاراستنی کۆمەڵایەتی، کە ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە

دابینکردنی ئەو پارمەتییە نەختینەیانەی بۆ خێزانە هەژارەکان لەلایەن دەوڵەتەوە دابینکرابوو.

توێژینەوەکە بەسەر سێ بەشدا دابەشکراوە. سەرەتا بە پێشەکییەک بۆ توێژینەوەکە دەست پێدەکات و بە کۆتاییەکیش کۆتایی دێت. کە پێکهاتووە لە گرنگترین ئەنجام و پێشنیارەکان کە هیوادارن، لەلایەن لایەنە پەیوەندیدارەکانەوە وەربگیرێن و سووی بۆیان هەبێت. بۆیە ئێمە بابەتی یەکەممان تەرخان کرد، بۆ زانینی جەوهەری تاوانی سواڵکردن چییە و لە دوو تەوەردا باسمان کرد. تەوەری یەکەم باس لە جەوهەری ئەم تاوانە دەکا و دووەمیشمان تەرخان کرد بۆ توێژینەوەی هۆکار و پاڵنەرەکانی ئەنجامدانی تاوانەکە و هۆکارە ناوخۆییەکانی. بەشی دووەم پێکهاتووە لە بڕیارە بابەتییەکان و دەرئەنجامەکانی تاوانەکە کە ئێمە لە دوو تەوەر باسمان کرد. لە تەوەری یەکەمدا باسمان لە بنەما گشتییەکانی تاوانی سواڵکردن کرد و لە تەوەری دووەمدا کاریگەرییەکانی ئەم تاوانەمان تاوتوێ کرد. بەشی سێیەم پێکهاتووە لە میکانیزمەکانی چارەسەرکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی تاوانی سواڵکردن، کە دوو لێکۆڵینەوەمان بۆ تەرخانکرد. یەکەمیان پێکدێت لە میکانیزمەکانی چارەسەرە نێودەوڵەتییەکان و دووەمیان تایبەتە بە میکانیزمەکانی چارەسەری نیشتمانی.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە لەم توێژینەوەدا میتۆدی توێژینەوەی یاساییمان بە پلەی یەکەم لەبەرچاو گرتووە، بە پلەی دووش، وەسف و باسکردنی تاوانەکە لە یاسای سزادانی عێراقی. ئەمە سەرباری ئەوەی تێبینی رەخنەی خۆمان لەسەر تەواوی تەوەرە باسکراوەکان و کەموکوری یاساکان باسکردووە و پێشنیار و بەدیلی خۆمان خستۆتەروو. هەروەها ئاماژەمان بە داتایەکی شیکاری شاری هەولێر کردووە.

**د. شاکر سلیمان محمود**

هەولێر/٢٠٢٢

# کێشەی توێژینەوەکە

کێشەی توێژینەوە خۆی لە لاوازی سزا و سزانەدانی کەیسەکانی سوالّکردنی شاراوە بەرجەستە دەکات، ئێستا ئەو حالّەتانە بە بەرچاوانەوە بەروونی دیارە، کە زۆربەی سوالّکەرەکان رووبەرووی لێپرسینەوەی یاسایی نابنەوە، چونکە ئەم کردەوانە لە خۆیاندا بە تاوان نازانرێن، هەروەها لاوازی ئەو ئامرازانەی کە یاسادانەر وەک سزای بەدیل پەنای بۆ دەبات، هەروەها نەرمی یاسادانەر بەرامبەر بەو حالّەتانەی کە سوالّکەرەکان سەرلەنوێ بۆ کاری سولّکردن دەگەڕێنەوە، سەرباری زۆری ژمارەی حالّەتەکانی دووبارە گەڕانەوە بۆ دیاردەی سولّکردن و لاوازی میکانیزمەکانی چارەسەری نێودەولّەتی و نیشتمانی، تاکو روون بکرێتەوە تا چەند حوکمەکانی یاسای سزادان گونجاون لەگەڵ ئەو گەشەسەندنە گەورەیەی لە ئامرازەکانی دیاردەی سوالّکردن روویانداوە، هەروەها روونکردنەوەی ئەوەی تا چ ڕادەیەک یاسا پارێزگاری بۆ نەوجەوانان یان منالّی سوالّکەر دابین دەکات.

## تاوانی سواڵکردن چییە؟

تاوانی سواڵکردن یەکێکە لەو تاوانانەی کە کاریگەری لەسەر ژیانی تاک و کۆمەڵگا هەیە. بۆیە لەم بەشەدا لە ڕێگەی دوو توێژینەوە باس لە دیاردەی سواڵکردن دەکەین: یەکەمیان تەرخانکراوە بۆ پێناسەکردنی چەمکی تاوانی سواڵکردن و لە دوو بەشدا مامەڵەی لەگەڵ دەکەین. یەکەمیان تەرخانکراوە بۆ پێناسەکردنی تاوانی سواڵکردن و لە دووەمیشدا باس لە سروشتی یاسایی تاوانەکە و ئەو بەرژەوەندییەی کە لەبەرچاو گیراوە لە تاوانبارکردنەکەدا، پاشان لە تەوەری دووەمدا باس لە هۆکارە پاڵنەرەکانی تاوانەکە و خودی تاوانەکە دەکەین، یەک لە دوای یەک مامەڵە لەگەڵ ئەو توێژینەوانە دەکەین.

# باسی یەکەم
# چەمکی تاوانی سواڵکردن

دیــــاردەی ســـــواڵکردن یەکـــێکە لە دیـــــاردە کــــۆمەلایەتییە مەترسیدارەکان، سـەرەڕای سروشت وشـێوازەکانی لە کۆمەڵگایەکەوە بـۆ کـۆمەڵگەیەکی دیـکە جیـاوازە، بـوونی سـواڵکەرەکان لادانـێکە لە سیستەمی گشتی کۆمەڵگا، فاکتەرەکانی بێکاری و بێبەشی و نایەکسـانی چینـایەتی رۆڵیـان لە زۆرکردنـی ژمـارەی سـواڵکەرەکان هەیە و ئەم تـاوانە بە شـێوەیەکی بەرفـراوان بـڵاودەکەنەوە[1]، وەک ئەوەی بۆمـان دەردەکەوێت، کە زۆربەی کۆمەڵگاکـان بەدەسـت ئەم تـاوانەوە دەناڵێنن، بەتـایبەتی لە وڵاتـانی جیهـانی سـێیەمدا بەروونـی دیـارە، ئەمەش دەگەڕێـتەوە بـۆ هۆکـاری جۆراوجـۆر، لەوانەش هۆکـاری ئـابووری و کۆمەلایەتی سیاسی. جگە لە هۆکارەکانی دیکە کە بەپێی سروشتی ئەو کۆمەڵگایانەی کە ئەم تاوانەی تێیدا بڵاودەبێتەوە جیاوازن، هەروەها ئەو تـاوانە لە شـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تـر و کـاتێکەوە بـۆ کـاتێکی دیـکە جیـاوازە. وەک بۆمـان دەردەکەوێـت کە تـاوانی سـواڵکردن ڕەنـگە ڕاسـتەوخۆ ڕوویـدات، جـا سـواڵکەرەکان پیـاو بـن یـان منـداڵ، یـان هەنـدێجار سـواڵکردن لە ژێـر پەردەی فرۆشـتنی کـاڵای سـادە و

ش. س. م.

١- د. ابتسام علام الجماعات الهامشية دراسة انثروبولوجية لجماعات المتسولين في مدينة القاهرة طا. ٢٠٠٢، ص ٤٠.

سرینەوەی جامی ئۆتۆمبێل یان فرۆشتنی بنێشت، یان لە ڕێگەی بڵاوبوونەوەی منداڵان لەبەردەم ترافیک لایتەکاندا، وروژاندنی سۆزی خەڵک[1]. بۆیە تێبینی دەکەین کە سواڵکردن دیاردەیە کۆمەڵایەتی مەترسیدارە و لە هەندێک کۆمەڵگادا نەخوازراو و قێزەونە، بەهۆی ئەو کاریگەرییە خراپەی لەسەر وڵات دروستی دەکات، چونکە ناوبانگی لەکەدار دەکات. سواڵکردن یەکێکە لە ئاڵۆزترین کێشەکان کە وڵات ماوەیەکی زۆرە بەدەستیەوە دەناڵێنێت. سواڵکردن دەرگایەکی شەرعییە بۆ ئەنجامدانی تاوان دادەنرێت، وەک بۆمان دەردەکەوێت کە زۆربەی سواڵکەرەکان دەچنە ناو گەڕەکەکانی نیشتەجێبوون، هەروەها دەچنە ناو ماڵی خێزانەکان و تێکەڵ بە منداڵان دەبن، ئەمە جگە لە بڵاوبوونەوەی سواڵکەران لەبەردەم ترافیک لایتەکاندا، ئەمەش پاڵنەرێکە بۆ ئەوان تاکو تاوانی دزیکردن یان فێری بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان ببن و ڕەواجی بۆ بکەن، سەرباری ئەوەی سواڵکردن کاریگەری لەسەر شێواندنی سیمای کۆمەڵایەتی وڵات هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین ئەو دەقە یاساییانە کە مامەڵە لەگەڵ سواڵکەرەکاندا دەکەن بۆ ڕێگریکردن لە سواڵکردنیان دەبینین کاریگەر نین. ئەگەرچی سواڵکردن تەنها دیاردەیەکی تاوانکاری نییە، بەڵکو بەرهەمی هەلومەرجی خراپی کۆمەڵایەتی و ئابوورییشە، کە ئەمەش وا دەکات تەنها مامەڵەی تۆمەتبار لەگەڵ سواڵکەر نەکات، چونکە سواڵکەر زۆربەی جار بۆتە قوربانی ئەم ئەو بارودۆخەی لە وڵات هەیە[2]، بۆیە زۆربەی یاساکان سزای تەرخانکردووە و سەپاندووە بەسەر سواڵکەر

ش. س. م.

١- د. رندة الفخري الطفل والجريمة في ظل قانون الأحداث والقواعد الدولية دراسة مقارنة منشورات زين الحقوقية بيروت, ٢٠١٤, ص ٣٥

٢- د. نادية مصطفى حسين، المسؤولية الجنائية للتسول. دار المسلة بغداد، ٢٠٢٣، ص٥٦.

له كاتی ئه‌نجامدانی ئه‌و ڕه‌فتاری سواڵكردنه‌كه‌، جا چ سواڵییه‌كه‌ی وه‌ك پیشه‌یه‌ك یان یان وه‌ك كارێك بۆ خۆ بژێوی كردبێت[1]. ئه‌م باسه ده‌كه‌ینه دوو ته‌وه‌ر، له یه‌كه‌مدا، پێناسه‌ی تاوانی سواڵكردن ده‌كه‌ین و له دووه‌میشدا سروشتی یاسایی تاوانه‌كه و ئه‌و به‌رژه‌وه‌ندییه‌ی كه له‌به‌رچاو گیراوه له‌و سزایه‌ی كه یاسادانه‌ر بۆی داناوه.

ش. س. م.

١- بۆ زانیاری زیاتر سه‌یری سه‌یری: قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل في المواد ( ٣٩٠/١) بكه، كه ئه‌مه ده‌قه‌یه‌تی: (هه‌ر كه‌سێك به مه‌به‌ستی سواڵكردن له‌سه‌ر جاده‌ی گشتی یان له شوێنه گشتییه‌كان یان به‌بێ مۆڵه‌ت بچێته ناو ماڵێك یان فرۆشگایه‌ك، له‌ماده‌ی ٢ی برگه‌ی سه‌ره‌وه هاتووه: سزا ده‌درێت به زیندانیكردن بۆ ماوه‌ی كه‌متر له مانگێك و له سێ مانگ زیاتر نه‌بێت. ئه‌گه‌ر ئه‌نجامده‌ره‌كه ته‌مه‌نی هه‌ژده ساڵی ته‌واو نه‌كردبێت، حوكمه‌كانی نه‌وجه‌وانانی به‌سه‌ردا جێبه‌جێ ده‌كرێت).

# تەوەری یەکەم
# پێناسەکردنی تاوانی سواڵکردن

لەم تەوەرەدا پێناسەی تاوانی سواڵکردن لە ڕووی زمانەوانی و زاراوە ڕوون دەکەینەوە، ئەم تەوەرە بەسەر دوو لقدا دابەش دەکەین: یەکەمیان پێناسەکردنی تاوانی سواڵکردن لەرووی زمانەوانی، دووەمیان تەرخان دەکەین بۆ پێناسەکردنی لەرووی زارەوەوە.

## لقی یەکەم
## پێناسەی تاوانی سواڵکردن لەرووی زمانەوانییەوە

لەم لقەدا باس لە چەمکەکانی تاوان و سواڵکردن لەرووی زمانەوانی دەکەین.

یەکەم: پێناسەی تاوان لە زماندا

تاوان لە زمانەکەدا چەندین مانای هەیە، هەندێجار بە مانای بڕین هاتووە، وەک چۆن دەوترێت درەختی بڕاو، هەروەها دەوترێت تاوانە بە مانای گوناە یان تاوانباری، بۆیە دەوترێت گوناهی کردووە و واتا تاوانێکی ئەنجامداوە، هەروەها دەوترێت تاوانباریکرد، واتا تۆمەتێکی داوە پاڵ[1]، خودای گەورە لە قورئانی پیرۆز فەرموویەتی: (إن المجرمين في ضلال وسعر)[2] هەروەها فەرموویەتی: (إن الذين أجرموا كانوا من الذين آمنوا يضحكون)[3].

ش. س. م.

١- الفيروز أبادي مجد الدين بن يعقوب القاموس المحيط ج ١. نويلس للطباعة.

٢- سورة القمر الآية ٤٧

٣- سورة المطففين الآية ٢٩.

دووەم: سواڵکردن لەرووی زمانەوانییەوە

لە زمانـدا بـۆ وشـەی سـواڵکردن زۆر مانـای هەیە، سـەرچاوەی وشـەی (سـول) مەبەسـت لێـی ئـارامکردنەوەی گەدەیە، وەک چـۆن بە وشەی (التسويل) بۆ باشترکردن و جوانکردنی شت هـاتووە، هەروەهـا وشـەی (التسـويل) لەسـەر وەزنـی وشـەی (التفعيـل) هـاتووە، وەک دەوترێت: (من سولت له نفسه كذا) واتا وەک ئەوەی خۆی رازاندبییەوە وایە، یان دەگوترێت (سولت لـه الشيطان) واتـا شـەیتان خراپە ئەوەندە جوان بۆ رازاندبووە، تاکو پێی فریوبدرێت[1]، بە هەمان شێوە ئەم مانایە لە قورئانی پیرۆزیش هـاتووە: (وجاءوا على قميصه بدم كذب قال بل سولت لكم أنفسكم أمرا فصبر جميل والله المستعان على ما تصفون)[2]. هەروەهـا وشـەی (التسـول) لە چـاوگی (سـأل و سـؤال و مسـألة) وەرگیراوە، واتا شتێکی لێ داوا بکە، واتا پێویستی بۆ دابین بکە[3]. وەک خودای گەورە فەرموویەتی (وأما السائل فلا تنهر)[4]، واتا هیوا و ئومێدی هەر مرۆڤێک[5]، وەک خودای گەورە فەرموویەتی: (قال قد أوتيت سؤالك يا موسى)[6]، واتا ئەوەی تەمەننات دەکرد، بەدەستی بێنی، پێتدرا.

ش. س. م.

١- ابن منظور، جمال الدين محمد بن مكرم لسان العرب، ج ٦ ط ٣ دار إحياء التراث العربي للنشر والتوزيع، بيروت ١٩٩٩ ص ٤٣٩

٢- سورة يوسف ١٨.

٣- الشيخ احمد رضا، معجم متن اللغة، ج٣، دار مكتبة للحياة، بيروت ١٩٥٩، ص٨٧.

٤- سورة الضحى ١٠.

٥- سعد الخليفة الخبار، احكام التسول فقها وقانونا، مجلة بحوث القانونية، جامعة مصراته، كلية القانون، عدد١، السنة ٢٠١٥، ص٧٨.

٦- سورة طه ٣٦.

## لقی دووەم
## پێناسەی تاوانی سواڵکردن لەرووی زاراوەوە

لەم لقەدا باس لە پێناسەی تاوانی سواڵکردن دەکەین لەسەر ئاستی یاسایی و دادوەری و فیقهی،
ئێمە یەک لە دوای یەک مامەڵە لەگەڵ ئەم بڕگانە خوارەوە دەکەین:
یەکەم: پێناسەی تاوانی سواڵکردن لەرووی یاساییەوە
یاسادانەری عێراقیش، لە زۆربەی یاساکانی تاوانی سواڵکردنی پێناسە نەکردووە، بەڵام لە یاسای سزادان لە بەشی هەشتەمی تاوانە کۆمەڵایەتییەکان مامەڵەی لەگەڵ سواڵکردن کرد کردووە، کە بەشی هەشتەم بەناونیشانی (سواڵکردن)ە، ئەمەش دەقی ئەو یاساییە کە دەڵێت: هەر کەسێک بە مەبەستی سواڵکردن لەسەر جادەی گشتی یان لە شوێنە گشتییەکان یان بەبێ مۆڵەت بچێتە ناو ماڵێک یان فرۆشگایەک، سزا دەدرێت بە زیندانیکردن بۆ ماوەی کەمتر لە مانگێک و لە سێ مانگ زیاتر نەبێت[1]. ئەگەر ئەنجامدەرەکە تەمەنی هەژدەساڵی تەواو نەکردبێت، حوکمەکانی نەوجەوانانی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت[2].دادگا بۆی هەیە لەبری ئەو سزایەی کە لە مادەی ١/٣٩٠دا هاتووە، ئەگەر توانای کارکردنی هەبێت، دەتوانێت فەرمانی ئەوە بدات کە بۆ ماوەیەک کە لە ساڵێک زیاتر نەبێت لە خانەی کارپێکردن بهێڵدرێتەوە، بەڵام ئەگەر نەتوانێت کار بکات و پارەی نەبێت پێی بژی

ش. س. م.

١- سەیری مادەی: المادة ٣٩٠/١ قانون العقوبات العراقي التي رفعت شرط من كان له مورد مشروع يتعيش منه أو كان يستطيع بعمله الحصول على هذا المورد بموجب قانون رقم ١٦ لسنة ١٩٩٩ والمنشور في الوقائع العراقية بالعدد ٣٧٨٨ في ١٤/٦/١٩٩٩.

٢- سەیری مادەی: ٣٩٠/٢ قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل.

بۆی هەیە لە شوێنێکی داڵدەدان، یان لە ماڵی بەساڵاچووان، یان لە دامەزراوەیەکی خێرخوازی دانپێدانراودا دابنرێت[1]. هەروەها یاسادانەری عێراق سزای (بەندکردن بۆ ماوەی سێ ساڵێک زیاتر نەبێت، بۆ هەرکەسێک کە هانی کەسێکی دیکەبدات بۆ سواڵکردن)[2] دانا. هەروەها یاسادانەری عێراق مامەڵەی لەگەڵ پرسی سواڵکردن لە یاسای (أصول المحاكمات الجزائية) بە ژمارە ۲۳ی ساڵی ۱۹۷۱ کردووە، کە لە بەشی سێیەمدا هەمووارکرایەوە (ڕەچاوکردنی ئارامی و جوانی ڕەفتاری کردووە). هەرچەندە بەڕوونی باسی سواڵکردن ناکات، بەڵام بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێت و دەڵێت: "بۆ داواکاری گشتی یان دادوەری لێکۆڵینەوە هەیە، کە دادوەری کەتن لەبارەی ئەو کەسانەی خوارەوە ئاگادار بکاتەوە، ئەگەر ترسی ئەوەی هەبێت، کە کردەوەیەک ئەنجام بدەن کە پێشێلی ئارامی دەکات، لێکۆڵینەوە و بەڵگەکان بە ئاگادارکردنەوەکە هاوپێچ بکرێن: ۱- هەر کەسێک کە ئامرازی بژێوییەکەی دیار نییە"[3].

سەرەڕای ئەمەش زۆربەی دادگاکان لەبارەی سواڵکەرەکان قسە لەگەڵ فەرمانگەی چاودێری کۆمەڵایەتی ناکەن، هەرچەندە یاسای پاراستنی کۆمەڵایەتی داوا دەکات لیژنەیەکی باڵا بۆ پاراستنی کۆمەڵایەتی لە ناوەندی ئەو پارێزگایانە پێکبهێنرێت کە لە هەرێمێکدا ڕێکنەخراون، ئەمەش بە بڕیاری سەرۆکی کۆمسیۆن[4]، بەڵام پێمان وایە

---

ش. س. م.

١- سەیری: المادة ٣٩١ قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل.

٢- المادة ٣٩٢ قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩.

٣- سەیری: لمادة ٣٢١/١ من قانون أصول المحاكمات الجزائية رقم ٢٣ لسنة ١٩٧١ المعدل.

٤- سەیری: المادة ١١ من قانون الحماية الاجتماعية رقم ١١ لسنة ٢٠١٤كە بە دەق هاتووەک (بە بڕیاری سەرۆکی دەستە، لیژنەیەکی باڵا بە ناوی لیژنەی باڵای

دەبوو یاسادانەر دەقی مادەی ٢٣ی یاسای چاودێری کۆمەڵایەتی بپارێزێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بیکاتە قەڵغانێک لەبەردەمی هەر کەسێک کە نیازی ئەوەی بێت سواڵ بکات، سەرەڕای باشتربوونی بڕی هاوکارییە کۆمەڵایەتییەکان، بەهەمان شێوە یاسادانەری عێراق لە یاسای چاودێری خاوەن پێداویستی تایبەت و ئەوانەی باری تایبەتیان هەیە بە ژمارە ٣٨ی ساڵی ٢٠١٣ مامەڵەی لەگەڵ سواڵکردن کردووە، بە مەبەستی چاودێریکردنی کەمئەندامان و دابینکردنی ژیانێکی خۆشگوزەران بۆ ئەوانەی کە حوکمەکانی ئەم یاسایە دەیانگرێتەوە[١].

لە لایەکی دیکەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە یاسادانەر لە مامەڵەکانیدا لە لایەک سەرکەوتوو بووە و لە چەند لایەنێکیش سەرکەوتوو نەبووە، لەمیانەی ئەمانەی خوارەوە:

---

پاراستنی کۆمەڵایەتی لە سەنتەری هەر پارێزگایەک دروست دەکرێت، کە لەمانە پێکهاتبێ:

یەکەم: دادوەرێکی موتەفەرغ، کە لەلایەن ئەنجومەنی باڵای دادوەرییەوە وەک سەرۆک کاندید کرابێت.

دووەم: بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی پارێزگاکە، وەک جێگری سەرۆک بێت.

سێیەم: بەڕێوەبەری ئاماری پارێزگا، ئەندام.

چوارەم: نوێنەری فەرمانگەی کۆمیساری مافی مرۆڤ، ئەندام

پێنجەم: فەرمانبەرێک بە نازناوی توێژەری کۆمەڵایەتی لە بەشی پاراستنی کۆمەڵایەتی لە پارێزگا، وەک ئەندام

١- سەیری: المادة ٢٢ من قانون رعاية ذوي الإعاقة والاحتياجات الخاصة رقم ٣٨ لسنة ٢٠١٣ العراقي، کە تێیدا هاتووە: (هەر کەمئەندامێک یان خاوەن پێداویستیەک، ئەگەر ئەو کەمئەندامییەی وەک ئامراز بۆ سواڵکردن قۆستەوە، سزای زیندانیکردن بۆ ماوەیەک کە لە ٦ مانگ زیاتر نەبێت یان غەرامەکردن کە لە ٥٠٠ هەزار و پێنج سەد هەزار دینار کەمتر نەبێت و لە یەک هەزار ملیۆن زیاتر نەبێت دەسەپێندرێت بەسەریدا).

١ سەرکەوتوو بوو لە پێناسە نەکردنی تاوانی سواڵکردن، ئەمەش کارێکی چاکە کردوویەتی، چونکە پێناسەکردنەکە لە پسپۆڕێتی فیقهدایە.
٢ سەرکەوتوو بوو لەوەی سواڵکەری جەستە تەندروست و سواڵکەری جەستە نادروستی لێک جیا نەکردەوە. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە بەرژەوەندی یان مەبەست لە سزدان پاراستنی مافی مرۆڤ و پاراستنی سەلیقەی گشتیی و لەبەرچاوگرتنی هەستی هاوولاتیان و هەراسان نەکردنیان لەکاتی گەران و سوڕانیان، بە سواڵکردن و پاڕانەوە لێیان.
بەڵام ئێمە لایەنەکانی دیکەوە ئاماژە بە بەشێک لە لایەنە سەرنەکەوتووەکانی یاسادانەری عێراقی دەکەین، کە خۆی لەمانەی خوارەوە دەنوێنێ:
١ یاسادانەری عێراقی ئاماژەی بە فرۆشتنی کاڵای بێ بایەخ یان پێشکەشکردنی چەند یارییەکی سەرنجراکێش وەک وێنەی تاوانی سواڵکردن نەکردووە، لەکاتێکدا زۆربەی سواڵکەرەکان لە ئێستادا چەند کاڵایەکی کەم بایەخ نیشانی دەدەن، وەک کلینکس یان چەند خزمەتگوزارییەکی بێ بەهای وەک جام سڕینەوە لە ترافیک لایتەکان پێشکەش دەکەن، ئەو کارانەش بە گشتی بەکاری سواڵکردن دادەنرێن.
٢ یاسادانەر بە گوێرەی حوکمەکانی مادەی ٢/٣٩٠ی یاسای سزادانی سواڵکردنی نەوجەوانانی بە تاوان داناوە، بەمەش حوکمەکانی بەرپرسیارێتی نەوجەوانانی بەسەر دەسەپێ، کەچی نەوجەوان کاتێک سواڵ دەکات بە تاوان دانانرێت، بەڵکو لەمیانەی سواڵکردنەکەی تووشی مەترسیش دەبێتەوە، بۆیە پێویستە لەسەر یاسادانەر لە رێگەی دەوڵەتەوە چارەسەیری ئەو کێشەیە بکات، نەوەک سزای بدات، چونکە ئەو نەوجەوانە زۆر شت نازانێ، ئەو تەنها بژێوی رۆژانەی دەوێت،

لەوانەشە لەلایەن کەس و کاریی یان کەسێکی دیکەوە بۆ ئەم کارە ناچارکرابێت.

هەروەها یاسای قەدەغەکردنی بازرگانیکردن بە مرۆڤ ژمارە (٢٨)ی ساڵی ٢٠١٢ عێراقی لە مادەی یەکەمدا باسی لە سواڵکردن کردووە و جۆرەکانی ئیستغلالکردنی بۆ هەشت شێوە سنووردارکردووە[١]، یەکێک لەوانەش سواڵکردنە، بەو پێیەی یەکێک لە ئامانجەکانی سواڵکردن بازرگانیکردنە بە مرۆڤەوە، چونکە تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ ئەو کاتە روودەدات، ئەگەر ئامانجی تاوانبارەکە لەو کارەی دەیکات، ئەوە بێت، وا لە قوربانییەکەی بدات بە هەر شێوەیەک بێت دەست لەم و لەو پان بکاتەوە، فۆرمی ئیستغلالکردنی جەستەیی، کە بە سواڵکردنی رێکخراو ناسراوە، کە خۆی لە باندە تاوانکارییە رێکخراوەکان دەبینێتەوە، تایبەتن بە رفاندنی منداڵان و ناچارکردنیان بە سواڵکردن لە رێگەی دەمچەورکردنیان یان تۆقاندنیان بۆ ئەوەی پارەیان دەستبکەوێت[٢]. هەروەها یاسادانەری عێراق لە یاسای چاودێری کۆمەڵایەتی ژمارە ١٢٦ی ساڵی ١٩٨٠ لە دەوازەی

ش. س. م.

١- بۆ زانیاری زیاتر سەیری: المادة ١/ أولا من قانون مکافحة الاتجار بالبشر العراقي رقم ٢٨ لسنة ٢٠١٢، کە بە دەق هاتووە: (هێنان، گواستنەوە، داڵدەدان، یان وەرگرتنی کەسانێک بە رێگەی هەرەشە یان بەکارهێنانی هێز یان جۆرەکانی تری زۆرەملێ، رفاندن، فریودان، خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات، یان بە پێدانی پارە یان وەرگرتنی بڕە پارە، سوودی دارایی، یان سوود وەرگرتنی بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی کەسێک کە دەسەڵاتدارە یان سەرپەرشتیکردنی کەسێک بە ئامانجی فرۆشتنی ئەو کەسە یان ئیستغلالکردنی بۆ کاری لەشفرۆشی، کاری زۆرەملێ، کۆیلایەتی، سواڵکردن، یان بازرگانیکردن بە ئەندامە مرۆییەکانی بۆ مەبەستی تاقیکردنەوە پزیشکییەکان).

٢- احمد عبد القادر، جریمة الاتجار بالبشر دراسة مقارنة شرکة العاتک، بیروت، ص١٢٣.

دووەم لە بەشی سێیەمدا مامەڵەی لەگەڵ دیاردەی سواڵکردن کردووە، ئەویش بە بێبەشکردنی لە مووچەی چاودێری کۆمەلایەتی، ئەگەر یەکێک لە ئەندامەکانی پیادەی سواڵکردنی کرد، ئەمەش بە بڕیاری دادگای پەیوەندیدار دەبێت[1].

دووەم: تاوانی سواڵکردن

بۆ دیاردەی سواڵکردن زۆر مانای فیقهی هەیە، بەبێ ئەوەی پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ تاوانی سواڵکردن بکرێت، وەک هەندێک پێناسەی تاوانەکەیان کردووە بەم شێوەیە (ڕەفتارێکی کۆمەلایەتییە، کە هەڕەشە لە یەکێک لە بەرژەوەندییە سەرەتاییەکانی کۆمەڵگا دەکات، کە قەوارەی کۆمەڵگا لەسەری بنیات نراوە و هەڕەشەی مەترسی لەسەر دەکات، دواتر هەستێک لە ویژدانی گشتیدا دەورژێنێ، کەوا پێویست دەکات ئەوانە سزا بدرێن)[2]. لە کاتێکدا هەندێکی دیکە سواڵکردنیان بەم شێوەیە پێناسە کردووە: (ئەو کردەیە، کە بەهۆی یاساوە سزای لەسەرە و بڕیاری سزدانی تاوانی بۆ هەیە)[3]، کەچی هەندێکی دیکە سواڵکردن وا پێناسە کردووە (دەرۆزەکردن و وەرگرتنی خێر لە ئەوانی دیکە، بەبێ

ش. س. م.

١- سەیری: المادة ٢٣ ثانیا/ قانون الرعایة الاجتماعیة رقم ١٢٦ لسنة ١٩٨٠ عیراقی، کە بە دەق هاتووە: (خێزان بە بڕیاری لیژنەی چاودێری خێزان و بە بڕیاری دادگای تایبەتمەند لە مووچەی چاودێری کۆمەلایەتی مەحروم دەبێت لە یەکێک لەم حاڵەتانەی خوارەوە: ئەگەر یەکێک لە ئەندامەکانی سواڵکردن پراکتیزە بکات· دەروازدەی دووەمی یاسای چاودێری کۆمەلایەتی بەپێی مادەی ٣٠ی یاسای پاراستنی کۆمەلایەتی ژمارە ١١ی ساڵی ٢٠١٤ هەڵوەشاوەتەوە)

٢-د جلال ثروت نظم القسم العام في قانون العقوبات نظریة الجریمة دار الجامعة الجدیدة, الإسکندریة ٢٠١٠ ص ١١٤.

٣- د. عبدا لقادر القهوجي وفتوح عبد الله الشاذلي، علم الإجرام وعلم العقاب مطابع السعدي, ٢٠٠٧, ص٦٩

بەرامبەر و بەبێ ئەوەی ئەو بەرامبەرە داوای کردبێ)[1]. لێرەوە مرۆڤ بە سـوالکەر دادەنرێت، ئەگەر بینرا کە سـوال دەکـات و داوای خێـر و سەدەقە دەکات، تەنانەت ئەگەر ئەو کارە سوالکەرەیی بە هەریەکێک لە کردەوە شەرعیەکانی وەک فرۆشتنی کالای کەم بەها و بنێشت و هەر کـالایەکی کەم بەهـای دیکە شـاردبێ، ئەگەر باسـی وشـەی شوێنیشـی نەکردبووایە باشتر بوو، دەبێ ئاماژە بە روودانی سوالەکە بکات لە هەر شوێنێک بووایە، هەروەهـا هەندێکیان وا پێناسـەیان کـردووە (چەمکێکی دەروونییە یـان چەمکێکی زانسـتی گرنگی بـواری زانسـتە مرۆییەکـانە، بەلام زاراوەیەکە کە مـرۆڤ بەهـۆیەوە لە بـارودۆخی ئەو کەسـانە تێدەگات، کە بەدوای پێویستیی مـادی دەگەڕێن)[2]. بۆمـان دەردەکەوێت کە ئەم پێناسـەیە کەیسـەکانی دیاردەی سـوالکردنی پشتگوێخستووە کە لەلایەن بانـدە تاوانکارەکـانەوە سپۆنسـەر دەکـرێن، کە تێیـدا پـالنەرەکە بەهـۆی پێویسـتییەوە نیـیە، بەلکـو سـوالکردن پیشـەیەکە بـۆ ئەوان. هەندێکی تـریش پێناسـەی سـوالکەریان وا کـردووە "دۆخـی بەرگەگرتنی کەسـێک بـۆ سـوالکردن، جـا دۆخەکەی رەوا بێـت یـان نـا، ئەمەش وێنەیەکی سەرزەنشتکراوە نە لەلایەن شەریعەتەوە پەسـەند کراوە و نە لەیاسـاکانی مرۆڤیش پەسـەند کراوە، ئەمە حـالەتێکە تێیدا مرۆڤ ناچـار دەکرێـت سـوالکردن بکـاتە پیشـە بۆخـۆی، بـۆیە لێـی پـال دەکەوێ، ئەو

ش. س. م.

١- د. حسين الشيخ محمد طه الباليساني. جريمة التسول بحث منشور في جملة تەرازوو، يصـدرها اتحـاد حقـوقي كردسـتان، العـدد ٣٢ و ٣٣، سـنة ٢٠٠٧، ص١١١ص١٢٨.

٢- بسيمة الحلفاوي، التسول في المغرب من الاباء الى الابناء، ط١، بدون مكان نشر ٢٠٠٦، ص٧٧.

توانــا و وزەیە بەکارنــاهێنێ کە خــودای گەورە پێــی بەخشــیووە"[1]. لە کاتێکدا هەندێکی تر بەم شێوەیە پێناسەیان کردووە: "بە پیشەکردنی سواڵ بۆ ئەوەی داوای پارە لە خەڵک بکات بە هەر شێوەیەک بێت و بەبێ ئەوەی پاساوێکی شەرعی هەبێت)[2]، واتە سواڵکردن دەکاتە پیشە و کارێک، خۆی لەسەر ڕادێنێ و بە ڕێگەی جۆراوجۆر بەکاریدەهێنێت بۆ بەدەستهێنانی پارە، بە نیشاندانی برینەکانی یان ورووژاندنی هەستی خەڵک لەکاتێکدا ئەم پارەیە وەردەگرێت و پشت بە هیچ هۆکارێک نابەستێت، کە ڕێگەی پێبدات ئەو کارە بکات. هەندێکیان پێناسەکە یان وا کردووە "هەر کەسێک، لە ڕەگەزی نێر یان مێ، کە تەمەنی گەیشتە هەژدە ساڵ، هەوڵی بەدەستهێنانی سوودی ماددی لە خەڵک بدات، بەبێ بەرامبەر، جا چ لەسەر ڕێگای گشتی و دوکان و شوێنە گشتیەکان بێت، یان چوونە ناو ماڵان بێت، بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئەو سوودە، ئەو کەسە سواڵکەرە".

بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەم پێناسەیە ئەو حاڵەتانەی سواڵکردن پشتگوێ خستووە، کە لەلایەن نەوجەوانانەوە ڕوودەدەن و باندە تاوانکارییەکان بۆ ورووژاندنی هاوسۆزی خەڵک دەیقۆزنەوە، هەروەها دەڵێت "سوربون لەسەر سواڵکردن یان دەرکەوتن وەک کەسێکی هەژار و داماو لەبەردەم کەسانی دیکەدا بۆ ئەوەی هاوسۆزی و بەزەیی ئەوان بەدەست بێنێ، تاکو پارەی بدەنێ، چ ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بە پێشکەشکردنی کاڵای بێ بایەخ یان هەڵگرتنی هەر ئامرازێکی قەرز یان ڕاچێتەی دکتۆر یان هەڵگرتنی منداڵ و لەبەرکردنی جل و بەرگی خراپ

ش. س. م.

١- د. سعد خليفة العبار أحكام التسول فقها وقانونا مجلة البحوث القانونية جامعة مصراتة كلية قانون، عدد ١ السنة ٢٠١٥، ص٧٨.

٢- رضا إسماعيل ظاهرة التسول ودور الشرطة في مكافحتها, القاهرة, ١٩٨٠, ص ٧٢٦.

یــان ئەنجامــدانی کــردەوەی بــێ بــایەخ[1]. لە کاتێکـدا هەنـدێکی تـر وا پێناسەیان کردووە: (هەر کەسێک کە لە لایەن دەسەڵاتی تایبەتمەندەوە بەهۆی سوالکردنەوە دەستگیر دەکرێت، بە مەبەستی بەدەستهێنانی پـارە، جـا ئەمە ڕاسـتەوخۆ لەلایەن کەسـانی دیـکەوە بێـت، یـان ناراستەوخۆ لەرێگەی پێشکەشکردنی کاڵایەکی بێ بایەخ بە خەڵک بە مەبەستی کڕینی بێت، یان نیشاندانی کەمئەندامی جەستەیی خۆیان، یان هەڵگرتنی کاغەزی ئیفلاسی بانکی، یان لەبەرکردنی جل و بەرگی کۆنە و پینەکراو، بۆ ئەوەی هاوسۆزی خەڵکی بۆ لای خۆیان رابکێشن و پارەیان پێ بدەن)[2]. دەبینین لەم یاسایەدا ئامرازەکانی کاری سوالکردنی ژماردووە، باشتر بوو بە دەستەواژەیەک بیگوتبا: ئەگەر سوالکەرە پەنا بۆ هەر ئامرازێک بەرێت تاکو سواڵی پێ بکات و لەداهاتوودا پەرە بە کاری سوالکەرییەکەی بدات.

لەمیـانەی بەسـەرکردنەوەی ئەو پێناسـانەی پێشـوو، کە لەلایەن یاسادانان و فیقهیدا پێشکەشکراون، دەتوانین تـاوانی سـوالکردن بەم شێوەیە پێناسە بکەین: هەموو کردارێکە کە بە سـوالکردن، داوای خێر، یان داواکردن بە هەر ئامرازێکەوە بێت، کە پەنا بەرێتە بەر فرتوفێڵ هەڵخەڵەتاندن بەمەستی ورژاندنی هەست و سۆزی خەڵک یان لەرێگەی پێشکەشـکردنی چەنـد خزمەتگـوزاری و کـاڵایەکی کەم نـرخ، لە هەر شـوێنێ، کە بەهـۆیەوە بتوانێ پارە یـان سـوودێکی بێ رەوای دەسـت بکەوێ، بەو کەسە دەگوترێت، سوالکەر.

ش. س. م.

١- د. حسين الشيخ محمد طه الباليساني. جريمة التسول. مصدر السابق ص١١١،ص١٣٨.

٢- ادم سميان ذياب، جريمة التسول، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية القانون، جامعة بغداد، سنة ٢٠٠١، ص٢٥.

# تەوەری دووەم
# سروشتی یاسایی و بەرژەوەندی لە بەتاوانکردن لەبەرچاو دەگیرێت

ئەم تەوەرە بەسەر دوو لقدا دابەشکراوە، لە یەکەمدا باس لە سروشتی یاسایی تاوانەکە دەکەین و دووەمیان تەرخان دەکەین بۆ ئەو بەرژەوەندییەی کە لە بەتاوانکرد لەبەرچاو گیراوە.

## لقی یەکەم
## سروشتی یاسایی

ئێمە لە چەند لایەنێکەوە باس لە سروشتی یاسایی ئەم تاوانە دەکەین:

**یەکەم: لەڕووی ئەنجامی تاوانەکە:**

دەرئەنجامی تاوانکاری بریتییە لە کاریگەریی ڕەفتاری تاوانکاری یان دەستدرێژییەک کە کاریگەری لەسەر بەرژەوەندی یان ئەو مافە هەیە، کە یاسا بڕیاری لەسەر دەدات بۆ پاراستنی تاوان، وەک بۆمان دەردەکەوێت کە پۆلێنکردنی یاسایی، تاوانەکان دابەش دەکات بەسەر دوو جۆر تاوان: تاوانی مەترسیدار و تاوانی زیانگەیاندن، تاوانی زیانە، بەو تاوانانە پێناسە دەکرێت: (لە ئەنجامی ئەو ڕەفتارە تاوانکارییەی کە بووەتە هۆی ئەوەی کە پەیوەندییەکی جەستەیی هەبێت، لە جیهانی دەرەوەدا ڕوودەدەن. تاوانی کوشتن کاریگەری لەسەر جیهانی دەرەوە

دروســت دەكــات، كە خــۆی لە مردنــی قوربــانییەكە دەبینێــتەوە[1]، زیانەكـانیش لەوانەیە مـاددی یـان ئەخلاقـی بـن، یـان شـەرەف لەكەدار بكەن یان ڕێز لەدەست بدەن، یان كاریگەری لەسەر تاكێك هەبێت یان كـاریگەری لەسـەر بەرژەوەنـدی كۆمەڵایەتی یـان بەرژەوەنـدی گشـتی كۆمەڵگا هەبێت)[2].

هەرچـی تـاوانی مەترسـیدارە، هەنـدێك وا پێناسـەیانكردووە: (ئەو تاوانـانەن، كە كـاریگەری كـردەی تـاوانی لە ئەگەر دەسـتدرێژیكردن بـۆ سەر مافێك لێدەكەوێتەوە)[3].

**دووەم: لەڕووی قەبارەی تاوانەك:** بۆمان دەردەكەوێت یاسادانەری عێراقی تاوانەكان لە ڕووی قەبارەوە دابەشكردووە بەسەر: تاوان، كەتن و سەرپێچی[4]. تاوانی كەتن بە یەكێك لەم دووانە سزا دەدرێت:

١ زیندانیكردنی توند یان سادە، زیاتر لە سێ مانگ تا پێنج ساڵ.

٢ پێبژاردن[5].

سەبارەت بە سەرپێچی، ئەوە تاوانبار بە یەكێك لە دوو سزایە سزا دەدرێت:

ش. س. م.

١- د. نظام توفيق المجالي شرح قانون العقوبات القسم العام دراسة تحليلية في النظرية العامة للجريمة والمسؤولية الجزائية, ط٣ دار الثقافة للنشر والتوزيع الأردن ٢٠١٠، ص ٢١٥

٢- د.عبد الباسط محمد سيف الحكيمي . النظرية العامة للجرائم ذات الحظر العام الطبعة الأولى الدار العلمية الدولية للنشر, عمان, ٢٠٠٢ ص١٤٣

٣- د. فخرى عبدالرزاق، شرح قانون العقوبات، ط٢. القاهرة، ٢٠١٠، ص ١٩١٩.

٤- المادة ٢٣ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

٥- المادة ٢٦ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

١ زیندانیکردنی ساده بۆ ماوەی بیست و چوار سەعات تا سێ مانگ.

٢ پێبژاردن، کە بڕەکەی لە ٥٠٠٠٠ پەنجا هەزار زیاتر نەبێت[1].

بەم پێیە بۆمان دەردەکەوێت کە سزای سەرپێچیکردن لە یاسای عێراقدا، وەک لە یاسای سزاداندا هاتووە، زیندانیکردن و غەرامەکردنە، هەروەک یاسای غەرامەکانیش بەپێی یاسای هەموارکردنەوەی غەرامە داراییەکان هەموار کراوەتەوە[2]. لەمانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەری عێراقی سێ دابەشکاری پەسەندکردووە بۆ ئەوەی جۆری تاوانەکە لەڕووی قەبارەکەیەوە بزانێت، بەهۆیەوە پێوانەی ئەو سزایەی کردووە، کە لە چوارچێوەی تاوانەکەدا بڕیاری لەسەر دەدرێت بە گوێرەی بڕگەکانی یاساکە، واتە ڕێگە بە دادگاکان نادات بڕیاری

ش. س. م.

١- لمادة ٢٧ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل.

٢- بۆ زانیاری زیاتر سەیری: قانون تعديل الغرامات رقم ٦ لسنة ٢٠٠٨ المعدل. دوای هەمووارکردنەووەکە پێبژاردن بووە: بڕە پارەیەک کەمتر نەبێت لە ٥٠،٠٠٠ هەزار زیاتر نەبێت ٢٠٠،٠٠٠ هەزار بۆ کەتنیش بڕە پارەیەک کە لە ٢٠١،٠٠٠ هەزار کەمتر نەبێت و لە دوو ملیۆنیش زیاتر نەبێت، بۆ تاوانەکانیش بڕێک بێت لە دوو ملیۆن کەمتر نەبێت و لە دە ملیۆنیش زیاتر نەبێت.

دادوەری لێکۆڵینەوە بەمشێوەیە بڕیارەکە دەدا:

بینم و بڕیارمدا، کە:

یەک: بڕیارمدا بە غەرامەکردنی تۆمەتبار (فولانی کوڕی فولان) بە پێی ئەحکامی مادەی ٣٩٠ لە یاسای سزادانی عێراقی، بە بڕی (٤٥٠٠٠) چل و پێنج هەزار دینار، ئەگەر تۆمەتبار ئەو بڕە پارەی پێنەدرا، بۆ ماوەی (١٥) پازدە ڕۆژ بەند بکرێت، بۆ هەر ڕۆژێکیش لە بەندکردنەکەی بڕی (٣٠٠٠) سێ هەزار دینار لە غەرامەکە هەژمار بکرێت، ئەمەش پاڵپشت بە ئەحکامی مادەی ١٣٢ی یاسای ئصولی محاکەماتی جەزائی.

دوو: بڕیارەکە لە تۆماری دادگا تۆمار بکرێت.

سێ: بخرێتە بەردەستی بەرێز ئەندامانی داواکاری گشتی.

خۆیـان لەبـارەوە بـدەن[1]. ئـێمە وتـی دەبینـین تـاوانی سـواڵکردن سەرپێچییە، بەپێی برگەکانی ماددەی ٣٩٠ی یاسای سزادانی عێراقی، باشتر بوو یاسادانەر تاوانەکە بکاتە تاوانی کەتن و سزای توندتری بەسـەردا بسـەپێنێت بـۆ ئەوەی سـزاکە ببێـتە ڕێگـر، ئەمەش بەهـۆی زیادبوونی بەرچاوی تاوانەکان و سەرهەڵدانی باندە تاوانکارییەکان کە ڕۆڵـی سـەرەکی دەگێـڕن لە ئامـادەکردنی کەسـانی تەمەن جیـاواز و ڕاکێشان لە شەقامەکان و بەکارهێنانی شێوازی جیاواز لەگەڵیان، وەک چۆن دەبینین سواڵکەرەکان بە شەقام و جادەکان بەبەر چاوی تەواوی ئەندامانی پۆلیسی دادوەریدا بڵاون، ئەمەش بەهۆی لاوازی سزاکەوەیە.

سێیەم: لە ڕووی دەرکەوتنی ڕەفتارەوە

تاوانەکان لە ڕووی دەرکەوتنی ڕەفتارەوە، دابەش دەکرێن بەسـەر تـاوانی ئەرێنـی (ایجـابي) و تـاوانی نەرێنـی (سـلبي). تـاوانی ئەرێنـی ئەو کردەوەیەک کە تاوانبار دەیکات، کەچی یاسا ڕێگەی بەکردنـی نەداوە[2]. وەک کردنـی کـارێکی یاسـاغ و قەدەغەکـرا[3]، هەرچـی تـاوانی نەرێنـیە، بـریتییە لەو کـردەوانەی کە تاوانبـار نایکـات، کەچـی یاسـای فەرمـانی پێکردووە، بیکات[4]، وەک تاوانی خۆدزینەوە لە شایەتی دان، و هەربۆیە

ش. س. م.

١- المادة ٢٤ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل. (ئاماژەی بەوەشکردووە، "جۆری تاوانەکە ناگۆڕێت ئەگەر دادگا سزای دیاریکراو بگۆڕێت بە جـۆرێکی سـووکتر لە سـزا، جـا بە بیـانووی سـووککەرەوە بێـت یـان بارودۆخێکی دادوەری بێت، مەگەر یاسا بە پێچەوانەوە دیاری نەکات")

٢- د. علي حسين خلف- د. سلطان عبد القادر الشاوي / المبادئ العامة في قانون العقوبات ط٢, العاتك الصناعه الكتاب, القاهرة ٢٠١٠, ص ٣٠٨

٣- عبد الستار البزركان, قانون العقوبات القسم العام بين التشريع والفقه والقضاء, سنة ٢٠٠٤, مصدر سابق ص٥٤.

٤- د. علي حسين خلف د. سلطان عبد القادر الشاوي / المبادئ العامة في قانون العقوبات مصدر سابق ص٣٠٨

تاوانەکە لەسەر بنەمای کردارێکە، ڕەنگە کردارەکە ئەرێنی و نەرێنی بێت. چونکە کردارەکە گوزارشت لە ئیرادە دەکات لە جیهانی دەرەکیدا، لە ڕێگەی جوولەیەکەوە کە لە جەستەی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێت و دەتوانرێت بە هەستەوەرەکان هەستی پێبکرێت[1]. سەبارەت بە کردەوەی نەرێنی، ئەو کردەوەیە کە تاوانبار "خۆی دووردەگرێ لە ئەنجامدانی کردارێک، کە یاسا یان ڕێکەوتنێک فەرمانی بە کردنی داوە[2]". یاسادانەریش مەرجی ئەوەی دانا کە تاوانەکە لە شوێنێکی گشتیدا ڕووبدات، جائامرازەکەی هەرچییەک بێت، تەنانەت ئەگەر سواڵکەرەکە دانیشتبێتیش ئەوا تاوانی سواڵکردنەکە، یەکێکە لە تاوانە ئەرێنییەکان، چونکە بەهۆی کردەوەیەک، ئاماژەیەک، یان نیشانەیەک لە سواڵکەرەکەوە ئەنجام دەدرێت، پێویستە یاسادانەر بزانێ کە دانیشتن و

ش. س. م.

١- د. فخري عبد الرزاق الحديثي، شرح قانون العقوبات القسم العام، شركة العاتك لصناعة الكتب، القاهرة، ٢٠١٠، ص٣٨.

بۆ زانیاری زیاتر سەیری: المادة ١٩/٤ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل، بکە، کە تێیدا هاتووە: کردەیەک بریتییە لە هەموو کردەوەیەک کە بە یاسا تاوانبار کراوە، جا ئەرێنی بێت یان نەرێنی، وەک وازهێنان و خۆبەدوورگرتن، مەگەر بە پێچەوانەوە دیاری نەکرێت." - بڕوانە مادەی ٣٤ لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی هەموارکراوی ساڵی ١٩٦٩. تاوانەکە بە مەبەستە، "ئەگەر یاسا یان ڕێککەوتنەکە ئەرکێک بەسەر کەسێکدا بسەپێنێت و خۆی لە جێبەجێکردنی بەدوور بگرێت، بە مەبەستی ڕووداوەکانی ئەو تاوانەی کە ڕاستەوخۆ لەمەوە سەریهەڵداوە" والتي تنص على أنه "الفعل هو كل تصرف جرمه القانون سواء كان ايجابيا ام سلبياً كالترك والامتناع مالم يرد نص على خلاف ذلك". -

٢- بڕوانە مادەی ٣٤ لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی هەموارکراوی ساڵی ١٩٦٩. تاوانەکە بە مەبەستە، "ئەگەر یاسا یان ڕێککەوتنەکە ئەرکێک بەسەر کەسێکدا بسەپێنێت و خۆی لە جێبەجێکردنی بەدوور بگرێت، بە مەبەستی ڕووداوەکانی ئەو تاوانەی کە ڕاستەوخۆ لەمەوە سەریهەڵداوە"

بينينى سوالكەر لە شوێنى گشتيى ئازاى هەستى هاولاتيان دەدات، بە پشتبەستن بەوانەى سەرەوە، بۆمان دەردەكەوێت، كە تاوانى سوالكردن يەكێكە لە تاوانە ئەرێنييەكان، وەك چۆن سوالكردن بە كردەوەى تاوانبار نەبێت، بوونى نابێت.

چوارەم: لەڕووى بەردەوامى ڕەفتارى تاوانكارييەوە

ڕەنگە ڕەفتارى تاوانكارى كاتى بێت يان بەردەوام بێت، لەسەر ئەم بنەمايە تاوانەكان دابەش دەكرێن بەسەر تاوانە بەردەوامەكان و تاوانە كاتييەكاندا، تاوانە كاتييەكان بەم شێوەيە پێناسە كران كە (ئەو تاوانانە كە تێيدا ڕەفتارى تاوانكارى، پێكهاتووە لە توخمە مادديیەكەى لە كردارێك كە لە كاوەيەكى كورت ڕوودەدات و لە ماوەيەكى دياريكراويش كۆتايى دێت، جا ڕەفتارەكە ئەرێنى بێت يان نەرێنى)[1] ، سەبارەت بە تاوانە بەردەوامەكان، ئەوان "تاوانگەلێكن كە ڕەفتارى تاوانكارى لە حاڵەتێكى بەردەوامدايە بە شێوەيەكى بەردەوام و درێژدەبێتەوە، توخمە مادديیەكەى تاوانەكە بەبێ پچڕان بەردەوام دەمێنێتەوە)[2]، هەروەها بە "تاوانێك ناسراوە كە تێيدا ڕەفتارى تاوانكارى كە توخمە مادديیەكەى پێكدەهێنێت، سروشتى تاوانە بە خۆى هەڵگرى ڕەگەزى بەردەواميیە، جا ئەو حاڵەتە تاوانى ئەرێنى بێت يان نەرێنى"[3] وەك هەڵگرتنى چەك بەبێ مۆڵەت، لێرەدا كات كۆنترۆڵى دابەشبوونى تاوان دەكات بۆ تاوانە كاتييەكان و تاوانە بەردەوامەكان، ئەگەر وەختى لێكۆڵینەوە لە تاوانەكە زۆرى كات نەويست ئەوا ئێمە لەبەردەم تاوانێكى

ش. س. م.

١- - د. علي حسين خلف، د. سلطان عبد القادر الشاوي المصدر السابق ص ٣١١
٢ عبد الستار البزركان قانون العقوبات القسم العام مصدر سابق ص٥٦
٢- عبد الستار البزركان قانون العقوبات القسم العام مصدر سابق ص٥٦
٣- د علي حسين خلف، د. سلطان الشاوي المبادئ العامة في قانون العقوبات العام مصدر سابق ص ٣١١

کاتی داین، ئەگەر لێکۆڵینەوەکە زۆری خایاند، ئەوا ئێمە رووبەرووی تاوانێکی درێژخایەن بووینەتەوە[1]، یاسای عێراقی ئەو جیاکارییەی لەنێوان تاوانەکان نەکردووە و بۆ بەردەوام و کاتی دابەشی نەکردوون، ئێمە تاوانی سواڵکردن بە تاوانێکی کاتی دەبینین.[2]

## لقی دووەم
## بەرژەوەندیی لە بەتاوانکردن لەبەرچاو دەگیرێت

بەرژەوەندی ئامانجی مانەوەی کۆمەڵگایە. کۆمەڵگا لەمیانەی پاراستنی ئەو بەرژەوەندییەوە گەشە دەکات و بەردەوام دەبێت، جا ئەو بەرژەوەندییە چ هی تاکەکان بێت یان هی تەواوی کۆمەڵگەکە بێت، چونکە تاوان بە پێشێلکردنی رێساکانی یاسا و دەستدرێژی بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵ دادەنرێت، ئەمەش ئەو بنەمایەیە لەکاتی نووسینەوەی یاساکان لەبەرچاو دەگیرێت[3]، دەوڵەت سزاکان بە گوێرەی پێگەی ئەو بەرژەوەندییانەی لای کۆمەڵ دیاری دەکات و دادەنێت، ئەگەر بەرژەوەندییەکە زۆر گرنگ بێت، ئەوا یاسادانەر بەرزترین پارێزگاری لەمیانەی سزایەکی گەورە بۆ ئەو بەرژەوەندییە

ش. س. م.

١- د. نظام توفيق المجالي شرح قانون العقوبات القسم العام مصدر سابق ص٥٢.

٢- سەيرى: المادة ٤ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل والتي تنص بأنه يسري القانون الجديد على ما وقع قبل نفاذه من الجرائم المستمرة أو المتتابعة أو جرائم العادة التي يثابر على ارتكابها في ظله وإذا عدل القانون الجديد الأحكام الخاصة بالعود أو تعدد الجرائم فانه يسري على كل جريمة يصبح بها المتهم في حالة العود أو لتعدد ولو بالنسبة لجرائم وقعت قبل نفاذه".

٣- محمد علي مردان المصلحة المعتبرة في التجريم رسالة دكتوراه كلية القانون, جامعة الموصل ٢٠٠٢.ص١.

مەزەندە دەگات، ئەو بەرژەوەندییەش لە کۆمەڵگەیەک بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە، بەپێی پێداویستی و ڕەوشی کۆمەڵگە لە دیاریکردنی بەرژەوەندییەکە دەگۆڕێت، هەر کۆمەڵگایەک پێناسەکردنی خۆی بۆ ئەو بەرژەوەندییەی کە بابەتی پاراستنی یاساییە، دیاری دەکات[1]، بەمەش دەگەینە ئەو مۆدێلە یاساییەی تاوانەکە کە لە ڕێگەیەوە ئەو ڕەفتارەی کە پێشێلکردنی بەرژەوەندییەکە پێکدەهێنێت، دیاری دەکرێت و دەرئەنجامە مەترسیدارەکان یان زیانبەخشەکانی ڕەفتارەکە بەدوای خۆیدا دێنێت و دەگەینە ئەو هۆکارەی کە یاسادانەر پشتی پێبەستووە بۆ مەبەستی تاوانبارکردن. بۆمان دەردەکەوێت، کە یاسادانەر لە دیاریکردنی بەرژەوەندییەکەدا تەنیا نیە، بەڵکو بۆمان دەردەکەوێت تێڕوانینی کۆمەڵگا و داب و نەریتەکانی ڕۆڵێکی گەورەیان هەیە، سەرباری ئەمەش تایبەتمەندی ئەو بابەتە کە کەسەی پێ تاوانبار دەکرێت دووبارە ڕۆڵیان لە دیاریکردنی بڕی سزاکە هەیە[2]. کەچی یاسادانەری عێراقی سزای سواڵکردنی لە دەوازەی هەشتەمی تاوانە کۆمەڵایەتییەکان لە بەشی هەشتەمی یاسای سزادان داناوە، لێرەدا بەتاوانکردنەکە بۆ پارێزگاریکردن لە سەلیقەی گشتی دانراوە، کە لەوانەیە دیمەنەکانی سواڵکردن ئازاری هەست و نەستی خەڵک بدات و ببێتە هۆی زیانگەیاندن بە هاوڵاتیان و هەراسانکردنیان.

هەروەها بەرژەوەندی لە تاوانبارکردنی سواڵکەردا لە شێوازی سواڵکردندا دەردەکەوێت، کە خۆی لە مەترسی ئەنجامدانی تاوان لەلایەن سواڵکەرەوە دەبینێتەوە لە داهاتوودا، ئەمەش لە حاڵەتی لادان،

ش. س. م.

١- د. عبد الباسط سيف الحكيمي، النظرية العامة للجرائم ذات الخطر العام مصدر سابق ص١٢٣.

٢- قاضي ازاد حيدر باوه، المواجهة الجنائية لظاهرة التسول في اقليم كردستان، بحث مقدم الى مجلس قضاء في اقليم كردستان العراق، ٢٠٢١، ص٨.

کە ڕەنگە ئەو سواڵکەرە تووشی ببێت، هەروەها بۆ پاراستنی سەلیقەی گشتی بە گشتیە[1]، هەروەها لە پێناوی ئەوەی کەرامەتی مرۆڤ لە ئیستغلالکردنی جەستەیی بپارێزێت، ئەگەر ناچار بوو سواڵ بکات. چونکە باندگەلێک هەن کە منداڵان دەڕفێنن و ناچاریان دەکەن سواڵ بکەن، ئەمەش چ بە دەمشیرینکردنیان بێت یان بە ترساندنیان بێت[2]. بەو پێیەی سیاسەتی تاوانکاری مۆدێرن ئامانجی دانانی چوارچێوەیەک بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، یاسادانەریش تەنها ڕەفتارەکان بە تاوان دەزانێت، بۆ ئەوەی ئەم بەرژەوەندییانە نەخەنە مەترسییەوە، بەهۆیەوە قەوارەی کۆمەڵگا پارچە پارچە ببێت. یاسادانەر بە تاوانبارکردنی تاوانە مەترسیدارەکان، پەرۆشی خۆی بۆ دابینکردنی گەورەترین بڕی پارێزگاری بۆ بەها بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگا دووپات دەکاتەوە[3]، هەرچەندە سواڵکەر لەمیانەی سواڵکەی پێداویستی خۆی دابین دەکات، بەڵام پێشێلی یاسا و سیستەمی کۆمەڵایەتی دەکات، بۆیە یاسادانەر ئەو ڕەفتارەی بەتاوانکرد، کە خۆی لە دەرۆزەکردن دەبینێتەوە، بەتایبەتی کە سواڵکردن تاوانێکی مەترسیدارە، بەو پێیەی زیانێکە پێویست بەوە ناکات یاسادانەر بێت نمونەی تاوانەکە، تەواو بکات، نارەوایی بوونی ڕەفتارەکە خۆی لەو دەستدرێژییەی دەبینێتەوە، کە دەیکاتە سەر بەرژەوەندی گشتی، ئەم دەستدرێژییە ڕوودەدات یان بەدەست دێت، ئەگەر پێکهاتە ماددی و ئەخلاقیەکانی کردەوەکە، پێشێلی

ش. س. م.

١- د. محروس نصار الهيتي، النظرية العامة للجرائم الاجتماعية, الطبعة الأولى منشورات زين الحقوقية ٢٠١١, ص ١٥٦_١٥٧

٢- احمد عبد القادر خلف، جريمة الاتجار بالبشر دراسة مقارنة مصدر سابق، ص ١٢٠

٣- د. عبد الباسط محمد سيف الحكيمي, النظرية العامة للجرائم ذات الخطر العام مصدر سابق، ص ١٢٧

بەرژەوەندی بکات یان بیخەنە بەر مەترسی، یاسادانەر دەستوەردان دەکات لە تاوانبارکردن و سزادان، تەنها لەبەر ئەوەی ئەو ڕەفتارە هەرەشەیە لەسەر بەرژەوەندی یاسایی دروست دەکات[1]. بەو پێیەی تاوانی سواڵکردن تاوانێکی فەرمییە، یاسادانەر بەبێ ئەوەی پێویست بە گەیشتن بە ئەنجامە تاوانکارییەکە بکات، ڕەفتارەکان سزا دەدات و بە تاوانیان دەزانێت، بەرژەوەندیی لەوەدایە کە ئەو بەتاوانبارکردن لە پێناوی پاراستنی دەرکەوتەکانی سەلیقەی گشتی و بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگادایە.

ش. س. م.

١- رؤى نزار امين، الركن المعنوي وإثباته في الجرائم الشكلية دراسة مقارنة رسالة ماجستير مقدمة إلى معهد العلمين للدراسات العليا ٢٠١٦, ص ٣٨و٣٧

# باسی دووەم
# هۆکارەکانی پاڵنەر بۆ ئەنجامدانی تاوان و خودی تاوانی سواڵکردن

لەم توێژینەوەدا دوو تەوەر باس دەکەین، یەکەم تەرخان دەکەین بۆ روونکردنەوە هۆکارەکانی پاڵنەر بۆ تاوانی سواڵکردن، دووەمیش تایبەت دەکەین بە توێژینەوە لە خودی تاوانەکە، بەهۆی ئەوەی ئەم تاوانە بە چەند تاوانێکی دیکە دەچێت، باسی رووە لێکچووەکاینان دەکەین.

## تەوەری یەکەم
## پاڵنەر و بڵاوبوونەوەی دیاردەی سواڵکردن

هۆکار زۆرن کە دەبنە هۆی پاڵنەر بۆ ئەنجامدانی تاوانی سواڵکردن، بەڵام ئێمە باس لە هەندێک لەو هۆکارانە دەکەین، کە نزیکەی لە هەموو وڵاتاندا باون و بڵاوبونەتەوە، بۆیە لە خواروە باسی گرنگترین ئەو هۆکارانە دەکەین.

### لقی یەکەم
### هۆکارە سیاسییەکان

هۆکاری سیاسی زۆرن، بەڵام توێژینەوەکە سنووردار دەکەین بە دوو فاکتەری سەرەکی، ئەوانیش: گەندەڵی حکومەت و شەڕ و جەنگەکان.

## یەکەم: گەندەڵی حکومەتەکان

دیاردەی گەندەڵی یەکێکە لەو دیاردە ترسناکانەی، کە رووبەرووی هەموو ولاتان دەبێتەوە چ لە ولاتێکی پێشکەوتوو و دەولەمەند بێت یان ولاتانی تازەپێگەیشتوو بن، بەو پێیەی گەندەڵی رۆڵی رِوونی هەیە لە ئیفلیجکردنی پرۆسەی بونیاتنان و گەشەپێدانی ئابووری، هەروەها گەندەڵی توانای دەوڵەت لە دابینکردنی دارایی و بەرنامەکانی گەشەپێدان و گەیشتن بە ئامانجەکانی پەیوەست بە خۆشگوزەرانی هاوولاتی کەم دەکاتەوە[1]. زۆربەی یاساکان پێناسەی گەندەڵییان نەکردووە، لەوانەش یاسادانەری عێراقی پێناسەی گەندەڵی نەکردووە، بەلام یاسای دەستەی دەستپاکی ژمارە ٣٠ی ساڵی ٢٠١١/عێراقی ئاماژەی بە دەستەواژەی گەندەڵی کردووە[2]، لەمیانەی پێناسەکردنی پرسی گەندەڵی بەم شێوەیە پێناسەی کردووە: 'داوایەکی جەزاییە، لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە تاوانێک تێدا دەکرێت، کە پێشێلکردنی ئەرکەکانی فەرمانگەی گشتییە.[3]

دەبینین کە یاسادانەر سەرکەوتوو بوو لە پێناسە نەکردنی گەندەڵی، چونکە ئەوە لە پسپۆرێتی یاسادانەردا نییە بچێتە ناو پێناسەکانەوە، هەروەها بەهۆی پەرەسەندنی فۆرمەکانی گەندەڵی و جیاوازیەکانیان لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر، بەلام فیقهـ گەندەڵی بەو شێوەیە پێناسە کردووە (رِەفتاری پێچەوانەی ستانداردە یاسایی و ئەخلاقییەکان دژی بەرژەوەندی گشتیە،"کە لە کەسێک یان دەزگایەکیەوە

ش. س. م.

١- د.عصام عبد الفتاح مطر، الفساد الإداري ماهيته أسبابه ومظاهره دار الجامعة الجديدةالاسكندرية, ٢٠١١, ص٨

٢- قانون هيأة النزاهة العراقى رقم ٣٠ لسنة ٢٠١١

٣- المادة ١ من قانون هيأة النزاهة العراقي رقم ٣٠ لسنه ٢٠١١.

دەردەچێت)[1] ، هەندێکی دیکە وایان پێناسەکردووە: (بازرگانیکردن بە پۆستە گشتییەکان، یان خراپ بەکارهێنانی، یان دەستدرێژیکردنە سەر سامانی گشتی، یان بەرژەوەندی و مافەکانی دەوڵەت، یان کەمتەرخەمی نواندن لە پاراستن و پارێزگاریکردنیان)[2] رووخساری گەندەڵی بازرگانیکردنە بە پۆستە گشتیەکان، گەندەڵی حکومەت خۆی لە گەندەڵی دارایی و ئیداری دەبینێتەوە، کە بە گەورەترین گەندەڵی دادەنرێت، بەو پێیەی لادانە لە نەزمی گشتی و پابەندنەبوونی کاربەدەستانی حوکمییە پێوەی، تاکو بەرژەوەندییە مادییەکانی بێتەدی، ئەمەش ترسناکترین جۆری گەندەڵییە[3]. ئەم گەندەڵییەش زۆر شێوە و جۆری هەیە، لەوانە، خراپ بەکارهێنانی دارایی و پۆستی حکومی لەلایەن بەرپرسان و دەستگرتنیان بەسەر دارایی گشتی و پێشێلکردنی یاسا و رێنماییەکان یان لەرێگەی پێدانی بەرتیل بە بەرپرسانی جێبەجێکار بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتی رەوا و خراپ بەکارهێنانی ئەو دەسەڵاتەی پێیاندراوە[4]. گەندەڵی کاریگەری زۆری لەسەر وڵات هەیە، کە ئارامی وڵات ناجێگیر دەکات، چونکە گەندەڵی پەیوەستە بە جۆرەکانی تاوانی رێکخراوەوە، هەروەها دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی کاڵا و خزمەتگوزاریی خراپ یان نایاسایی وەک مادده هۆشبەرەکان هەروەها پەیوەندییەکەی بە بەفیرۆدانی تواناکان لە بەرنامەی گەشەپێدانی بەردەوام هەیە، هەروەها

ش. س. م.

١- د. محمود محمد عباره، الفساد الإداري وعلاجه في الشريعة الإسلامية ١ دار الثقافة للنشر والتوزيع عمان ٢٠١١, ص٧٤.

٢- امير فرج يوسف مكافحة الفساد الاداري والوظيفي وعلاقته بالجريمة على المستوى المحلي والإقليمي والدولي في ضل اتفاقية الأمم المتحدة لمكافحة الجريمة المكتب الجامعي الحديث الإسكندرية ٢٠١٠, ص٥٧.

٣- أمير فرج يوسف, المصدر اعلاه ص١١٥. ٤

٤- د. عمار فوزي المياحي الفساد الإداري وسبل علاجه وفقا لتقديرات البيئة العراقية مجلة المستقبل العراق العدد ٢٠٠٨, ص١٠٢

دەبێتە هۆی تێکچوونی دابەشکردنی داهات و سامان[1]. کە ئەمە هۆکارە لە بڵاوبوونەوەی تاوانەکانی سواڵکردن بەهۆی خراپی دابەشکردنی داهات و بەفیڕۆدانی سامانی گشتی، چونکە ئەگەر ئەو سامانە گشتییە لە شوێنی گونجاودا خەرج بکرێت، دەبێتە هۆی باشتربوونی تۆڕی پاراستنی کۆمەڵایەتی و هەموو چینە شایستە و هەژارەکان بەشیان دەبێت و خزمەتگوزارییە تەندروستی و کۆمەڵایەتییەکان باشتر دەبێت. گەندەڵی گەورەترین کاریگەری لەسەر بێبەشکردنی ئەو چینانە و تێکدانی هەموو خزمەتگوزارییە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان بۆ تاک هەیە.

لە عێراقدا گەندەڵی حکومەت لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ بە هۆی دەستێوەردانەکانی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی و لاوازی حکومەتە یەک لە دوای یەکەکان و نەدانی ئەولەویەت بە بەرژەوەندی گشتی وڵات پەیدابووە، بەڵام گەندەڵی دەسەڵاتی پێشوو لە هەموو ئاستەکاندا لەبیر ناکەین، بەڵام نامانەوێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو سەردەمە تاریکە لە مێژووی عێراقدا و سەرەڕای پەیوەستبوونی عێراق بە ڕێککەوتننامەکە یاسای دژە گەندەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ٢٠٠٣[2] و دەرکردنی یاسای دەستەی دەستپاکی ژمارە ٣٠ی ساڵی ٢٠١١، بەڵام هێشتا هەروایە باوترین وڵاتی عەرەبی سەرەڕای ئەوەی کە کارەکانی دەستە نوێنەرایەتی دەکرێت لە 'بەشداریکردن لە ڕێگریکردن و

ش. س. م.

١- د مكي عبد مجيد، الفساد المالي والإداري في العراق مجلة جامعة كربلاء المجلد السابع ٢٠٠٩ ص

٢- قانون انضمام العراق إلى اتفاقية الأمم المتحدة لمكافحة الفساد لعام ٢٠٠٣ رقم ٣ لسنة ٢٠٠٧

بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی [1] لە ڕێگەی میکانیزمە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکانی دەستەکە بۆ بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی، لەوانەش:

١ میکانیزمی ناڕاستەوخۆ، کە بریتین لە "دارشتنی ڕەشنووسی ستراتیژی نیشتمانی دژە گەندەڵی و ڕەوانەکردنی بۆ ئەنجومەنی وەزیران، دانانی پەیڕەوی ڕەفتاری پیشەیی (السلوك الوظيفي) ژمارە ١ بۆ ساڵی ٢٠١٦، ئەنجامدانی سیمینار و کۆنفرانس و وۆرکشۆپ، بڵاوکردنەوەی کلتووری یەکپارچەیی، پێشنیاری هەمووارکردنەوەی هەندێک یاسا، بە تایبەت یاسای قازانجی نارەوا (الكسب غير المشروع) و ڕەوانەکردنی بۆ ئەنجومەنی شورای دەوڵەت"، بۆیە ئەم میکانیزمە ناڕاستەوخۆیانە کاریگەرییەکی زۆریان نەبوو لە بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵیدا.

٢ میکانیزمە ڕاستەوخۆکانی دەستەکە بریتین لە:

أ -پابەندبوون بە یاسا لە بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی و گوێنەدان بە هیچ کاریگەرییەک.

ب - پێکهێنانی تیمی مەیدانی بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوە

٣ پێکهێنانی تیمی پشکنینی نهێنی گەڕۆک کە تایبەتن بە خزمەتکردنی هاوولاتی و بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی.

٤ بەدواداچوون بۆ قەدەغەکردنی گەشتکردنی دژ بەو کەسانەی کە تۆمەتبارن لە دۆسیەی گەندەڵی.

٥ بەدواداچوون بۆ دۆسیەکانی هەڵئاوسانی پارە و قازانجی رەوا و بەدواداچوون بۆ دۆسیەی وەرگرتنەوەی پارە بە هەماهەنگی لەگەڵ ئینتەرپۆل [2].

---

ش. س. م.

١- المادة ٣ من قانون هيأة النزاهة رقم ٣٠ لسنه ٢٠١١

٢- جمهورية العراق هيأة النزاهة ملخص التقرير السنوي لعام ٢٠١٦ ص٢ ٢

سەرەڕای هەماهەنگی لەگەڵ دەزگاکانی تری چاودێری وەک فەرمانگەی چاودێری دارایی و فەرمانگەکانی پشکنەرانی گشتی و هەموو ئەم میکانیزمانە، گەندەڵی حکومەت هێشتا زۆرە. ئەمەش بەربەستێکە کە بە ڕوونی ئاماژەیە بۆ بڵاوبوونەوەی گەندەڵی، ئەمەش بەڕوونی ئاماژەیە بۆ تەشەنەکردنی گەندەڵی، کە دەبێتە هۆی دواکەوتنی پێشکەوتن و بڵاوبوونەوەی سواڵکردن و دەرکەوتەکانی تری هەژاری و بێکاری و بڵاوبوونەوەی سواڵکردنی منداڵان و سواڵکەرانی بەساڵاچووان لەبەردەم و چاوی ئەندامانی پۆلیسی دادوەری، بەبێ ئەوەی هیچ ڕێوشوێنێک لەلایەن ئەوانەوە بگیرێتەبەر. بەم پێیە داوا لە دەزگا ئەمنییەکان دەکەین ڕێوشوێنی خۆپارێزی بگرنەبەر بۆ نەهێشتنی دەرکەوتەکانی سواڵکردن.

## دووەم: هۆکاری شەڕەکان لەسەر دیاردەی سواڵکردن

شەڕەکان بە واتای ململانێیەکی هەمەلایەنە کە تیایدا شێواز و ئامرازە سەربازییە جۆراوجۆرەکان بە ئامانجی لەناوبردنی هێزە سەربازییەکانی دیکە بەکاردەهێنرێن[1]، شەڕەکان بریتین لە زنجیرەیەک هەڵمەتی سەربازی کە لە نێوان هەردوولا دەستپێدەکەن، هەروەها کێشەکانی نێوان وڵاتان لەسەر سەروەریی، سەرچاوەکان، خاک، ئایدۆلۆژیا، یان ئایینە، بەو پێیەی کاریگەری لەسەر لەناوبردنی ژێرخانی ئابووری هەیە و لە ئەنجامدا باروودۆخی ژیانی سەختی لێدەکەوێتەوە، بەو پێیەی بێکاری بڵاودەبێتەوە و دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ئامرازەکانی بژێوی ژیان و دابەزینی ئاستی تەندروستی و پەروەردەیی خێزانەکان، ئەمەش کاریگەری لەسەر تەواوی کۆمەڵگا

ش. س. م.

١- د . توفيق الحاج القرار ١٣٧٣ والحرب على الإرهاب. منشورات زين الحقوقية ٢٠١٣, ص ٣٣٧

دەبێت[1]، ئەو داگیرکارییەی ئەمریکا دوای هەڵوەشاندنەوەی سوپا و خزمەتگوزارییە ئەمنییەکان کاریگەری هەبوو لەسەر لەدەستدانی تەواوی ئاسایشی وڵاتەکە، بە پاساوی بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئەمەریکا، عێراق بوو بە چەقی تیرۆری نێودەوڵەتی، هەروەها ژێرخانی عێراق وێران بوو و تایفەگەری و ململانێکان بڵاوبووەوە، بۆیە پیشەسازی و ئەوانی دیکە بەهۆی ئەم شەڕانەوە پەکیانکەوتن، ئەمەش کاریگەری لەسەر داهاتی هاووڵاتی و نەبوونی هەلی کار هەبوو[2]. هەروەها بۆمان دەردەکەوێت کە شەڕەکان کاریگەرییان لەسەر کۆچکردن هەبوو، بەو پێیەی ژمارەیەکی زۆر لە خێزانە عێراقییەکان کۆچیان کردووە بۆ ناوچەکانی دیکە، ئەمە سەرباری شەڕی داعشیش کە بووە هۆی ئاوارەبوونی هەزاران خێزان لە ماڵ و حاڵی خۆیان و بڵاوبوونەوەی نادادپەروەری و بەربەرییەتی ڕێکخراوەکەوە، ئەمەش ڕێژەی بێبەشی و سەختی ئابووری و هەژاری زیادتر کرد[3]. هەژاری لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دەبێتە هۆی سواڵکردن[4]. وەک چۆن شەڕەکان پێویستی بە خەرجکردنی بڕە پارەیەکی زۆر هەیە، گونجاوتر دەبوو ئەگەر ئەو بڕە پارەیە بۆ خزمەتکردنی هاووڵاتی و دابینکردنی کار و ژیانێکی شایستە بۆیان خەرج بکرابووایە. شەڕەکان لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا وێرانکاری و خاپوورکردن دێنێتە کایەوە.

ش. س. م.

١- امل حمدي دكاك, أثر الحروب والنزاعات المسلحة على الأسرة العربية مجلة جامعة دمشق المجلد ٢٣

٢- امل حمدي دكاك, أثر الحروب والنزاعات المسلحة على الأسرة العربية مجلة جامعة دمشق المجلد ٢٣

٣- د حكمت بشير, الحروب العدوانية وما أفرزته من قروض وتعويضات بحق العراق, الطبعة الأولى دار الزهراء للطباعة والنشر بيروت, ٢٠٠٩ ١٢٢-١٢٣

٤- مل حمدي, مصدر السابق، ص٢٣.

## لقی دووەم
## هۆكارە ئابوورییەكان

هۆكـارە ئابوورییەكـان گەورەتـرین ڕۆڵ دەگێـڕن و كاریگەریـان بەسەر بڵاوبوونەوەی سواڵكردن هەیە، لێرە باسی هەندێكیان دەكەین، كە گرنگترینیـان هەژاری و بێكـارییە، بەم شـێوەیە لە خـوارەوە دیـاری دەكەین:

### یەكەم: بڵاوبوونەوەی هەژاریی

هەژاری چەمكێكـی ئـاڵۆزە كە ڕەهەنـدە ئـابووری و كـۆمەڵایەتی و سیاسـییەكان لەخۆدەگرێت، كە خـۆی لە مەحـروم بـوون دەبینێـتەوە، ئەمەش ڕەنگدانەوەی لەسـەر تـاك دەبێت لەڕووی كەمتـر بەكارهێنـانی خـۆراك و خراپـی بـاری تەندروسـتی و خراپـی بـارودۆخی ژینگەیـی[1]، وەك ئەوەی هەژاریی بەم شێوەیە پێناسە دەكرێت: (بێ توانایی تاكەكان یـان خێزانەكـان لەوەی ببنە خـاوەنی دەرامەتـی پێویسـت بـۆ تێركردنـی پێداویستییە بنەڕەتییەكانیـان)[2]. سـواڵكەر لە هەمـوو بوارەكانـدا بەدەسـت بێبەشـی دەناڵێنێـت، هەژاریـش دەبێـتە هـۆی بێبەشـكردنی مـرۆڤ لە سـەرەتاییترین پێداویسـتییەكانی ژیـانی، ئەمەش وای لێـدەكات سـواڵ بكات، هەژاریی بەڵایەكی كۆمەڵایەتییە كە هەڕەشە لە قەوارەی كۆمەڵگا دەكات و تواناكانی لاواز دەكات، وە هۆكارێكی گرنگ و زەقە بۆ لادانـی تاكەكـان بەتـایبەتی منـداڵان، بەو پێـیەی هەژاریـی یەكـێكە لە هۆكـارە ئـابوورییە گرنگەكـان كە بەهـۆیەوە منـداڵ بەدوای گەرەنتییەكـدا بـۆ

ش. س. م.

١–د. نادية مصطفى حسين مصدر السابق ص٥٥.

٢– – قاضي ازاد حيدر باوه، مصدر السابق ص٢١.

سادەترین ئامرازەکانی ژیانی دەگەڕێت.[1] هەژاریی وا دەکات تاک بچێتە خوارەوەی پەیژەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییەوە، بەڵام هەژاری پاڵنەری سەرەکی نییە بۆ ئەنجامدانی تاوانکردن[2]، ڕێژەی هەژاری لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە جیاوازە و بۆمان دەردەکەوێت کە هەژاری لە عێراقدا، بەپێی ڕاپۆرتەکانی وەزارەتی پلاندانان لە ساڵی ٢٠١٦، لە ٣٠% زیاترە، بەهۆی سەرهەڵدانی داعش و قەیرانی ئابووری، ئەمانە لەنێو پارێزگاکان، وەک بەغدا و پارێزگاکانی باشوور ڕێژەی هەژارییان ٣٠%، لەکاتێکدا ناوچەکانی ڕۆژئاوا ڕێژەی هەژاری ٣٥%، و لە هەرێمی کوردستان ڕێژەی هەژاری لە نێوان ١٣ بۆ ١٥%، واتە کۆی گشتی ٢٣% دانیشتوانی عێراق لە ژێر هێڵی هەژاریدا دەژین.[3]

هەژاری هۆکارێکی گرنگە بۆ لادانی مرۆڤ و نەوجەوانان بە تایبەتی لە ڕێگای ڕاستودروست، سەختییەکانی ژیان، لاوازی ژیان، بێتوانایی باوک و بەخێوکەری خێزان لە پشتیوانی ئەندامەکانی. دەبێتە هۆی دەرچوونی منداڵان بۆ سەر شەقامەکان چ بۆ کارکردن بێت بۆ سواڵکردن بێت، ڕەنگە ئەم دەرچوونەش بە هاندانی کەس وکارەکەی بێت، وەک ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە نەوجەوان لە گۆڕەپانەکان و لەبەردەم ترافیک لایتەکاندا دەیبینین، کە دەبێتە هۆی کارەساتی کۆمەڵایەتی نالەبار.

ش. س. م.

١-- صلاح محمد محمود، النظام القانوني لحماية الأطفال المقاتلين في القانون الدولي الإنساني، دراسة الحالة في إفريقيا، مطبعة الفضيل، ٢٠١١، ص ١٦٥

٢- نادية مصطفى حسين، مصدر السابق، ص ٥٦.

٣- المادة ٢/١٢ من قانون الحماية الاجتماعية رقم ١١ لسنة ٢٠١٤، کە وا پێناسەی هێڵی هەژاریی کردووە: ("هێڵ هەژاری بریتییە لە بڕی داهاتی تاکێک یان خێزانێک کە وەزارەتی پلاندانان دیاری دەکات.)

**دووەم: بڵاوبوونەوەی بێکاری**

بێکاری پرسێکی جیهانییە، ڕێژەی ئەو پرسەی بەپێی وڵاتانی پێشکەوتوو و گەشەسەندووی جیهان دەگۆڕێت، ئامارەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە لە هەموو وڵاتانی جیهان یەک ملیار کەسی بێکار هەن[1]، بێکاریش دۆخێکە کە مرۆڤ تێیدایە توانای کارکردنی هەیە و ئارەزووی کارکردنیشی هەیە، بەڵام هیچ کارێک و کرێیەکی گونجاوی بۆ نادۆزرێتەوە[2]، بۆیە بێکاری یەکێکە لەو دیاردانەی کە زۆربەی وڵاتان بەدەستیەوە دەناڵێنن، هەموو وڵاتان هەوڵی کەمکردنەوەی دەدەن، بەهۆی کاریگەرییە نەرێنییەکانی لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی و ئابووری، چونکە بێکاری بریتییە لە پچڕانی سەرچاوەی سەرەکییە بژێوی خێزان، هەر بۆیەش سەرۆکی خێزان هانی ئەندامانی خێزانەکەی دەدات، تەنانەت هانی منداڵەکانیشان دەدەن بۆ کارکردن، ئەگەر کاریشی دەستنەکەوت، هەندێکیان پەنا بۆ دەبەن سواڵکردن و لادان، بۆیە بۆمان دەردەکەوێت، کە بێکاری ڕۆڵی لە بەرەوپێشبردنی دیاردەی سواڵکردن هەیە، کۆمەڵگا کاریگەری لەسەر پرسی بێکاری دەبێت، بەتایبەتی خێزان، کە کرۆکی کۆمەڵگایە، بەو پێیەی بوونی بێکاری دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندییەکانی خێزان لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، کاتێک مرۆڤ بێ هیوا دەبێت و دەرگای کارکردنی شەرعی لەبەردەمیدا دادەخرێت، ئەوا بێکاری دەبێتە پاڵنەرێک بۆ تاوانکاری، بۆیە پەنا بۆ سواڵکردن دەبات. بێکاری یەکێکە لەو هۆکارانەی وا دەکات توندوتیژی زیاد ببێت، چونکە سەختی ژیان کاریگەری لەسەر زیادبوونی ئاستی

ش. س. م.

١- عمر بن حكمت بن بشير, البطالة منهج التربية الإسلامية في معالجتها, رسالة ماجستير, الجامعة الإسلامية, الرياض, ٢٠١٢, ص ٦

٢-عبدا لله بن شبيب بن عبادي السياسة الجنائية لمكافحة التسول مصدر سابق ص٧٨

بێزاری خەڵک هەیە، هەژاری بۆ خۆی بە تەنیا پاڵنەرێک نییە بۆ توندوتیژی، بەڵکو خراپی بارودۆخی کۆمەلایەتی هەستی چەوساندنەوەی لای تاک دروست دەکات و بە ئەنجامدانی تاوان کۆتایی دێت. بێکاریش ڕۆڵێکی گرنگی لەمەدا هەیە[1]، بێکاری پەیوەندییەکی توندی بە خوێندنەوە هەیە، بەو پێیەی وازهێنان لە خوێندن هۆکارێکە بۆ ئیستغلالکردنی منداڵ، خراپی خوێندن یان دەرچوونی خوێندکار و مانەوەیان بەبێ کار، دەبێتە هۆی بەربلاوی بێکاری لە کۆمەڵگادا، لێرەوە پەروەردە فاکتەری گرنگە، هەربۆیە لە زۆرێک لە ڕێککەوتنە نێودەوڵەتییەکان باس لە گرنگیی پەروەردە دەکرێت. لە عێراق بەهۆی خراپی بارودۆخی ئابوورییەوە ڕێژەی بێکاری بەردەوام لە زیادبووندایە، ئەمەش کاریگەری لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگەی عێراقی هەیە، هۆکار و پاڵنەرە بۆ دیاردەی سواڵکردن لە کۆمەڵگەی عێراقدا.

## لقی سێیەم
## هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان

هۆکارە کۆمەلایەتییەکان ڕۆڵێکی سەرەکی لە زیادکردنی دیاردەی سواڵکردن دەگێڕن[2]، جیابوونەوە، کۆچکردن، وازهێنان لە خوێندن و هەڵوەشاندنەوەی خێزان ڕۆڵێکی سەرەکییان هەیە لە زیادکردنی دەرکەوتەکانی سواڵکردن و تاوانکاری و زیادبوونی حاڵەتەکانی تاوان، بۆیە ئەم بەشە تەرخان دەکەین بۆ دەستنیشانکردنی هەندێک لەو

ش. س. م.

١- د. علي حمزة عسيل، د. نورس رشيد طه، الوجيز في علم الاجرام، دار المسلة، بغدا، ٢٠٢٣، ص١٣٣.

٢- د. علي حمزة عسيل، نفس المصدر، ص٨٧.

هۆکارانە، لە خوارەوە باسیان دەکەین، گرنگترین ئەو هۆکارانەش بریتین لە:

## یەکەم: هەڵوەشاندنەوەی خێزان

خێزان یەکەم و سەرەکییترین خانەیە لە بنیاتنانی کۆمەڵگەدا، یەکەم جێگایە کە منداڵ تیایدا پەروەردە دەبێت و شوێن پێی خۆی لە بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی باش یان خراپ جێدەکاتەوە[1]، خێزانیش ناوکی یەکەمی بونیادی منداڵ، مامەڵەی نادروست و پەیوەندی نێوان منداڵ و دایک و باوکی، پشتگوێخستن، ناسەقامگیری خێزان و هاوڕێی خراپ، هەموویان هۆکاری کاریگەرن کە دەبنە هۆی هەڵوەشاندنەوەی خێزان[2]، خێزان رۆڵێکی سەرەکی لە کۆنترۆڵکردن و پێکهاتنی کەسایەتی تاک هەیە، بەو پێیەی تاک ئەزموونەکانی خۆی لە رێگەی خێزانەوە وەردەگرێت و یەکێک لە گرنگترین دەرکەوتەکانی هەڵوەشاندنەوەی خێزان بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەی ماددی کە مەبەست لێی نەبوونی یەکێک یان هەردوو دایک و باوکەکەیە، بۆیە بۆمان دەردەکەوێت کە زۆرێک لە ئامارەکان پشتڕاستیان کردەوە، کە پەیوەندییەکی نزیک لە نێوان هەڵوەشاندنەوەی خێزان و ئەنجامدانی تاواندا هەیە، وەک ئەوەی ئامارە فەرەنسییەکان دەریدەخەن، کە ٧٥%ی تاوانباران سەر بە خێزانە ناتەباکانن. هەروەها ئامارەکان دەیسەلمێنن کە ٦١%ی نەوجەوانانی تاوانبار، پەیوەندی خراپیان لەگەڵ خانەوادەکانیان هەبووە[3]. دەکرێت هەڵوەشاندنەوەی

ش. س. م.

١- سحر خليل محمود حقوق الطفل في الاسلام و الاتفاقيات الدولية دراسة مقارنة رسالة ماجستير جامعة النجاح الوطنية كلية الحقوق, ٢٠٠٤ ص٤

٢- القاضي، ازاد حيدر باوه، مصدر سابق، ص٢٢.

٣- د نوري سعدون عبد العوامل الاجتماعية المؤثرة في ارتكاب الجريمة, مجلة جامعة الانبار للعلوم الانسانية العدد الاول, ٢٠١١, ص ١٣٣

مـادی خێـزان وا پێناسـه بکەیـن: (ئاڕاسـتەی کـارلێککردنی نێـوان ئەو یەکـــانەی کە خێـــزان پێکـــدەهێنن، دژ بە ئاســـتە کـــۆمەڵایەتییە پەسـەندکراوەکان، بەجۆرێـک ئەمە دەبێـتە کۆسـپ لەبەردەم بەدیهـاتنی ئەرکەکـانی خێـزان، کە دەبێـت ئەو ئەرکـانە هەر جێبەجـێ بکـرێن تـاکو سەقامگیری دابین بکرێت)[1]. تەشەنەسـەندنی دیاردەی هەڵوەشـاندنەوەی خێزان لە زۆربەی کۆمەڵگا عەرەبییەکـانی ئێمەدا، لـێکەوتەی جـددی و کاردانەوەی نەرێنی لەسەر خێزانەکان و لەسەر کۆمەڵگا بەگشـتی هەیە، هەڵوەشـاندنەوەی خێـزان دەبێـتە هـۆی لەدەسـتدان و ناسـەقامگیری کۆمەڵگا، بەرەو توندوتیژی و تاوانکـاری دەبـات و دەبێتە هـۆی لادان و خـراپ ڕەفتـار وەک کـارێکی ئاسـایی لێدێت، خێـزانیش ئەمە بە شـتێکی سەیر نازانێت[2]. هەڵوەشاندنەوەی خێزان یەکێکە لە هۆکـارە گرنگەکـانی تـــاوان، وەک بۆمـــان دەردەکەوێـــت کە ســـەرۆکی خێـــزان پـــاڵ بە گەنجەکـانەوە دەنێـت بـۆ ئەنجامـدانی تـاوانەکە و کەس وکاریـان هـانی منداڵەکانیان دەدەن بۆ سواڵ کردن.

خێـزان هەنگـاوی یەکەمـی ڕێگـای پەروەردەکردنـی دروسـتە، کە یەکەم قۆنـاغە لە ژیـانی منداڵـدا، ئەگەر ئەو خێـزانە پـارێزراو بێـت و سەقامگیری خۆی بپارێزێت، ئەوا لە حـاڵەتی ڕێزگـرتن و خۆشەویستی و لێکتێگەیشـتندا دەبێـت و منـداڵ و تـاکی نـاو خێـزان پـێکەوە توانـای پێشـکەوتنیان بە شـێوەیەکی ڕێکوپێـک دەبێـت، بەڵام ئەگەر خێـزانەکە هەڵوەشێتەوە و لەیەکتر جیا ببێتەوە، کێشـە و ئاسـتەنگی لەبەردەم بێت و حاڵەتی توندوتیژی بەرامبەر بە منداڵان بکرێت، ئەوا ئەم دۆخە دەبێتە

ش. س. م.

١-د. عبد الخـالق محمـد عفيفي بنـاء الأسـرة والمشـكلات الأسـرية المعاصـرة المكتـب الجامعي الحديث٢٠١١،٢٦١

٢- د. عبـد الاميـر كـاظم زاهـد وقـائع أبحـاث مـؤتمر و قـوانين الأسـرة العراقيـة المشكلات و المعالجات ٢٠١٤ ص ٦٣٨.

هۆی لادان و ئەندامانی خێزان خێراتر و ئاسانتر لێکهەڵدەوەشێنەوە و زووتر بەرەو تاوان و پەنابردن بۆ سواڵکردن دەبن، سواڵکردنیش یەکێکە لە چارەسەرە ئاسانەکان بۆ ئەو خێزانانەی کە توانای تێکەڵبوونیان لەگەڵ کۆمەڵگادا لەدەستداوە و ناتەبایی زۆرە .

**دووەم: وازهێنان لە قوتابخانە**

وازهێنان لە قوتابخانە واتە "وازهێنان لە خوێندن پێش تەواوکردنی بە هەر هۆکارێک، جگە لە مردن، نەچوونە ناو هیچ قوتابخانەیەکی دیکەوە نەبێت، یان زوو وازهێنان لە خوێندن"[1]. هەندێکی دیکە وا پێناسەیان کردووە: (کە دابڕان یان کشانەوەی خوێندکار لە قوتابخانە لە ئەنجامی هۆکارێک یان چەند هۆکارێک، جگە لە مردن، پێش تەواوکردنی ئەو قۆناغە پەروەردەییەی کە تێیدا دەخوێنێت)[2]. کێشەی وازهێنان لە خوێندن، یەکێکە لە کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان و گرنگییەکی زۆری هەیە، چونکە دەبێتە هۆی بەربەست لە بەردەم پرۆسەی خوێندن و دەبێتە هۆی زیادبوونی بێکاری[3]. وازهێنان کاردانەوەی نەرێنی لە بوارە جۆراوجۆرەکانی پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و ئابووریدا جێدێڵێ، کاردانەوەی کۆمەڵایەتی بۆ نموونە خۆی لەوە دەبینێتەوە قوتابی جێهێشتوو کەمتر توانای بەشداریکردنی لە بونیادنانی کۆمەڵگاکەی دەبێت، کەمتر توانای کارلێککردنی هەیە و دەبێتە هۆی زیادبوونی

---

ش. س. م.

١- عبد الله سهو الناصر التسرب من التعليم الطريق المفتوح نحو عمل الاطفال, عمان ٢٠١٤, ص ١٧

٢- محمدي حمزة التسرب المدرسي رسالة ماجستير مقدمة إلى جامعة أبي بكر في الجزائر كلية العلوم قسم علم الاجتماع ٢٠١٥ ص٤٤

٣- د. شاكر سليمان محمود و توانا جمال، حق الطفل العراقي في التعليم واثر التقدم التكنولوجي عليه، بحث منشور في مجلة جامعة تكريت للحقوق، سنة (٥) العدد (١) جزء (٢)، السنة ٢٠٢٠، ص١٤٧، ١٦٨.

کێشەکانی وەک تاوانکاری و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان و هتد[1].
هەروەها بۆمان دەردەکەوێت کە نەبوونی بەدواداچوون لەلایەن دایک و باوکانەوە بۆ منداڵەکانیان بەشدارە لە حاڵەتی وازهێنان لە خوێندن و ڕەفتاری لادان لە هەرزەکاران. بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە وازهێنان لە خوێندن بەبێ هۆکارێکی ڕەوا ڕۆڵی لە سواڵکردن لەلای نەوجەواناندا هەیە[2] ، وەک چۆن دەبینین ژمارەیەکی زۆر لە نەوجەوانان لەبەردەم گۆڕەپانەکاندا و ترافیک لایتەکانن و قوتابخانەکانیان بەجێهێشتووە و بەرەو سواڵکردن ڕۆیشتوون، کە ئەمەش بە کارێکی ئاسان و قازانجبەخش بۆ ئەوان دادەنرێت. ئێمە وای دەبینین کە پێویستە خێزانەکان هاوکاری لەگەڵ دامەزراوەی زانستی بکەن بۆ ڕێگریکردن لە وازهێنانی منداڵەکانیان، هەروەها لەسەر دەستەی ڕاگەیاندن پێویستە جەخت لەسەر ڕۆڵی پەروەردە بکاتەوە و بەرنامەی ڕێنمایی بڵاوبکاتەوە، کە گوزارشت لە کێشەکانی وازهێنان لە خوێندن بکات ودامودەزگا پەیوەندیدارەکان خوێندنی ناچاری چالاک بکات.

تاوانی سواڵکردن تەنها بەو هۆکارانە سنووردار نییە، کە باسکراون، بەڵکو کەسانێک هەن سواڵ دەکەن، نەک لەبەر پێویستی، بەڵکو حەزیان لەوەیە پارە بەبێ کێشە و ماندوبوون بەدەستبێنن، ئێمە هیچ ڕۆڵێکی ڕوونی داواکاری گشتی لە تۆمارکردنی سکاڵایان لەدژیان نادۆزینەوە، بە مەبەستی پاراستنی سەلیقەی گشتی و بەرەنگاربوونەوەی تاوان، ئەمە جگە لە لاوازی دامودەزگانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن بە نوێنەرایەتی پۆلیس و دەزگاکانی دیکە، بە مەبەستی جێبەجێکردنی یاسا و نەهێشتنی ئەم تاوانە بڵاوەی سەرانسەری وڵات.

ش. س. م.

١- محمدي حمزة المصدر السابق ص ٥٤
٢- جعفر عبد الأمير الياسين التشرد وانحراف سلوك الصغار والأحداث في العراق دراسة ميدانيه في علم الاجتماع الجنائي رسالة دكتوراة جامعة بغداد كلية الآداب ٢٠٠٢ ص ٢٠٥

## تەوەری دووەم
## جیاکردنەوەی لەتاوانە هاوشێوەکانی

لەم تەوەردا باس لە جیاکردنەوەی تاوانی سواڵکردن دەکەین، لەوەی کە هاوشێوەیەتی، کە لە سێ تاواندا کورتی دەکەینەوە، ئەمەش لە سێ لقدا باس دەکەین، لە یەکەمدا لە تاوانی بێلانەیی (التشرد) جیای دەکەینەوە و هەڵوێستی یاسادانەری عێراقی لەسەری نیشان دەدەین. لە دووەمیاندا لە تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ جیای دەکەینەوە، چونکە ئەو بازرگانییە جۆرێکە لە ئیستغلالکردنی مرۆڤ کە لەلایەن باندە تاوانکارەکانەوە ئەنجام دەدرێت، کە ئامانجیان ئەوەیە قوربانییەکە بکەنە سواڵکەر. سێیەمیشیان تەرخان دەکەین بۆ جیاکردنەوەی لە تاوانی فێڵکردن (الاحتيال)، چونکە فێڵکردن جۆرێکە لە خەڵەتاندن. لە هەرسێ لقەکەدا باس لە رووی لێکچوون و رووی جیاوازییەکانیان دەکەین لەگەڵ تاوانی سواڵکردن.

### لقی یەکەم
### جیاکردنەوەی لە تاوانی بێلانەیی

بێ ماڵ و حاڵیی، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی مەترسیدارە کە هەرەشە لەسەر خودی بوونی کۆمەڵگاکان دروست دەکات، بێ لانەیی بە دەروازەی لادان و تاوانکاری دادەنرێت، بەهۆی توانای نەوجەوان بۆ وەرگرتنی رەفتاری هەڵە، ئەگەر قوزتنەوەی هەیە لەلایەن باندە تاوانکارەکانەوە، سەرباری ئەو زیانانەش کە تووشی خودی

نەوجەوانەکە دەبێت[1]، کە بە شێوە ڕەفتارێکی نا کۆمەڵایەتی دادەنرێت. کەی بێ لانەیی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، شێوازە ژیانێک لە کۆمەڵگادا دادەنرێـت، لەمیـانەی گـۆڕینی ڕەفتـاری کەسـەکە بـۆ تاوانبـارێکی ڕاستەقینە. پێویستە جیاوازیی لە نێوان بێ ماڵ و حاڵبوونی گەنجان و نەوجەوانـان لە لایەک و بـێ مـاڵ و حـاڵبوونی گەورەکـان لە لایەکـی دیـکەوە بکرێـت. حاڵەتەکـانی بێلانەیـی منـاڵان بەهـۆی کەمتەرخەمـی ئەوانەوەیە، کە یاسـا رایسـپاردوون سەرپەرشـتی ئەو منـاڵانە بـکەن، ئەمەش بە شێوەی جۆراوجۆر بەدی دێت، یان بە کەمتەرخەمی یان بە دابیننەکردنـی پێداویسـتییەکانی ژیـانی منـاڵەکە، یـان نەبـوونی ئەو کەسـانەی کە بەرپرسـن لە چاودێریدا بەهـۆی مـردن، جیابوونەوە یـان دەستگیرکردنەوە بێت.

سـەبارەت بە بـێ مـاڵ و حـاڵبوونی گەورەکـان، دەگەڕێـتەوە بـۆ گـرتنەبەری شـێوازێکی دیـاریکراوی ژیـان لەلایەن کەسـەکەوە، کە لە ئەنجامدا ئەو شێوە ژیان مەترسی لەسەر کۆمەڵگا دروست دەکات، جا ئەمە شێوازێکی و چالاکییەکی ئەرێنی بکات یان نەرێنی[2]. هەروەها بێ مـاڵ و حـاڵ حـاڵەتێکە لە نێـوان کەتنکەریـی و کەسـی ئاسـاییی، چـونکە نەوجەوان ئەو خێزانەی خۆی بەجێ هێشتووە، کە پشتیوانیان لێدەکرد، بەم شـێوەیەش لە ژێـر کـۆنترۆڵ و بەرپرسـیارێتی دەرچـووە، لێـرەوە ئامادەیە تاوان ئەنجام بدات، بێ مـاڵ و حـاڵیی ڕەفتـارێکی نەخوازراوە، کەسـی بێ مـاڵ و حـاڵ ڕەنگە سـواڵ بکـات، بەمەش بچێتە نـاو بازنەی

ش. س. م.

١-مهدي السعيد، دور الخدمة الاجتماعية في الحد أو التخفيف من ظاهره تشرد الأحداث رسالة ماجستير مقدمة إلى جامعة محمد بو ضايف كلية الآداب والعلوم الاجتماعية قسم علم الاجتماع ٢٠٠٥, ص ٦

٢- د. جعفر عبد الأمير الياسين، مصدر سابق ص.٤.

تــاوانەوە[1]. لێــرەوە بــاس لە پێناســەی بێلانەیــی دەکەیــن، پاشــان لێکچوونەکــانی نێــوان بێلانەیــی و ســوالْکردن ڕوون دەکەیــنەوە و جیاوازیەکان نیشان دەدەین.

**یەکەم: پێناسەکردنی تاوانی بێلانەیی**

لایەنێکــی فیقهــی بێلانەیــی بەم شــێوەیە پێناســە کــردووە: (خــۆبەدوورگرتن لە پەیــداکردنی بژێــوی ژیــان بە ڕێگــای ئاســایی، لە ڕووی پانتــاییەوە فراوانتــرە لە ســوالْکردن)[2]، بۆمــان دەردەکەوێــت کە بێلانەیی لەسەر دوو توخم دامەزراوە:

یەکەمیان بریتییە لە: بێکاربوونێکی خۆبەخشانەی نــارەوا، مەبەست لە بێکاری نارەوا چییە، ئەوەیە کە تایبەتمەندی بەردەوامی هەیە، نەوەک بێکارییەکی کاتی بێت.

**دووەم: نەبوون و لەدەستدانی سەرچاوەی دارایی**، مرۆڤی بێلانە بە لانەواز دادەنرێت، کاتێـک ســەرچاوەیەکی ڕەوای بــۆ بژێــوی ژیــانی خۆی نەبێت، واتە ئەگەر سەرچاوەیەکی دارایی هەبێت کە پێداویستییە زەورییەکــانی بــۆ دابــین بکــات یــان خێــر و ســەدەقەیەک لە لایەنێکــی خێرخوازیەوە وەربگرێت، ئەگەرچی پێداویستییەکانیشی بەتەواوی دابین نەکات، ئەوا بە بێلانە مــالْ و حــالْ نازانرێت[3]. لە کاتێکدا هەندێکیان بەم

ش. س. م.

١- د عدنان ياسين مصطفى ود كريم محمد حمزه، اطفال في نزاع مع القانون دراسة ضمن مشروع تعزيز الحماية والعدالة لأطفال والشباب في العراق, ٢٠١١, ص ٩.

٢-د. محروس نصار الهيتي، مصدر سابق ص١٥٦

٣-د. رؤوف عبيد, شرح قانون العقوبات التكميلي الطبعة الخامسة دار الفكر العربي . ١٩٧٩ ، ص ٢٨٧.

شێوەیە پێناسەیان کردووە کە: (هەر منداڵێکی بێ ماڵ و حاڵ دەشێت حکومەت بەپێی فەرمانی دادوەری دادگای تاوان بۆ قوتابخانەی بنێرێ[1]، بێ ماڵ و حاڵبوونی منداڵان بە یەکێک لە سەخترین جۆرەکانی بێلانەیی دادەنرێت، بەو پێیەی پاڵ بە نەوجەوانەوە دەنێت بۆ سواڵکردن و گەورەکانیش لەباوەشیان دەگرن، بۆ ئەوەی فێری تاوان و ڕەنگە بەکارهێنانی مادده هۆشبەر و قومارکردن و شتی دیکەشیان بکەن. بێلانەیی وا دەکات مرۆڤ دەست لەبەر خەڵک پان بکاتەوە، ئەمەش ئاسانترین ڕێگەیە بۆ کۆکردنەوەی پارە[2].

یاسادانەری عێراقی ، باسی پێناسەی تاوانی بێلانەیی ناکات و تەنانەت لە یاسای سزادانی هەموارکراوی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩دا، باسی سزای تاوانەکەشی نەکردووە، بەڵام فۆرمێکی بێلانەییمان لە یاسای سزادان، لە بەشی پێنجەمدا دۆزیەوە، پێشێلکارییەکانی پەیوەست بە ئەخلاقی گشتی، وەک ئەوەی تێیدا هاتبوو کە: (هەرکەسێک لە شوێنە گشتیەکاندا خۆی داڵدە بدات یان چاوی لەدەستی خەڵک بێت بۆ مەبەستێک یان ئامانجێک کە دژ ئادابی گشتی بێت، سزا دەدرێت بە زیندانیکردن بۆ ماوەی دە ڕۆژ زیاتر نەبێت یان غەرامەکردن کە لە پێنج دینار زیاتر نەبێت)[3] هەروەها یاسادانەری عێراقی لە یاسای (أصول المحاكمات الجزائية) ژمارە ٢٣ی ساڵی ١٩٧١، وەک لە بەشی سێیەمی هەموارکراو بابەتی دووەم، بەڵێنی پاراستنی ئارامی و هەڵسوکەوتی باش، دراوە، کە تێیدا هاتووە: (داواکاری گشتی یان دادوەری لێکۆڵینەوە

ش. س. م.

١-د. جندي عبد الملك، الموسوعة الجنائية مصدر سابق ص٢٠٧. ٦ - محمد علي جمال، التشرد والاشتباه، نيو أوفست الطباعة

٢- محمد علي جمال، التشرد والاشتباهم، مصدر السابق ص ٧٤.

٣- المادة ٥٠٢ من قانون العقوبات العراقي، قانون رقم ٦ لسنة ٢٠٠٨ قانون تعديل الغرامات المالية.

دەتوانێت دادوەری کەتن (قاضي الجنح) ئاگادار بکاتەوە، سەبارەت بەم کەسانەی خوارەوە ئاماژەیان پێدەدرێت، ئەگەر ترسی ئەوە هەبێت کە کردەوەیەک ئەنجام بدەن، ئاسایش و ئارامی بشێوێنێ، دەبێت ئەمە پشتگیریی بەڵگە و زانیاری هاوپێچ کراوی هەبێت: ١ - هەر کەسێک کە هۆکارێکی ڕوونی بۆ بژێوی نەبێ)[١].

یاسادانەری عێراق لە یاسای هەمووارکراوی نەوجەوانان ژمارە ٧٦ی ساڵی ١٩٨٣ مامەڵەی لەگەڵ بێلانەدا کردوە، بەڵام ئەو حاڵەتانەی ڕوونکردەوە کە نەوجەوان بە بێلانە دادەنرێت و ڕێوشوێنی بۆ ئەوە داناوە و سواڵکردنی بە جۆرێکە لە بێلانەیی هەژمارکردووە، پێویستی بە چارەسەر نەوەک سزا[٢].

دووەم: ڕووی لێکچوونەکانیان

لێکچوون لە نێوان تاوانی سواڵکردن و تاوانی بێلانەیی هەیە، لەوانە:

١ هەردووکیان کاریگەرییان لەسەر نەزمی کۆمەڵایەتی و سەقامگیری کۆمەڵایەتی هەیە، بەو پێیەی شێوازێک لە ڕەفتاری ناکۆمەڵایەتیە.

٢ چ بەژەوەندییە لە بەتاوانکردنی هەردووکیان هەیە.

---

ش. س. م.

١- المادة ٣٢١ من قانون أصول المحاكمات الجزائية العراقية رقم ٢٣ لسنة ١٩٧١ المعدل

٢-المادة ٢٤ أولا وثانيا من قانون رعاية الأحداث العراقي رقم ٧٦ لسنه ١٩٨٣ المعدل، کە تێیدا هاتووە: (منداڵی کەم تەمەن یان نەوجەوان بە بێلانە دادەنرێت، ئەگەر لە شوێنە گشتیەکاندا بینرا، کە سواڵ دەکات، یان برینداری یان کەمئەندامی خۆی نیشان بدات،یاندساختەکاری وەک ئامرازێک بۆ بەدەستهێنانی سۆز و خۆشەویستی خەڵک بە مەبەستی سواڵکردن بەکاربهێنرێت.)

ئەو بەرژەوەندییەی کە لە هەردوو تاوانەکە رەچاوکراوە، بریتییە لە پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ و پارێزگاریکردن لە کۆمەڵگا تاکو لەسەر هەموو ئاستەکانی بە تەندروست و شایستە بمێنێتەوە.

٣ بێلانەیی پەیوەندی بە سوالّکردنەوە هەیە لای نەوجەوانان و منالان، بەو پێیەی نەوجەوان بە بێلانە دادەنرێت، ئەگەر بنیرا، کە سوالّ دەکات[1].

٤ بێلانەیی باوترین جۆری سوالّکردن، کە نەوجەوانان ئەنجامی دەدەن.

٥ پەیوەندی و توندی نێوانیاندا، هەمان لێکەوتەی ترسناکی لەسەر کۆمەڵگادا دەبێت، وەک پێشێلکردنی سەلیقەی گشتی، ئازاردانی هەستی گشتی لای هاوولاتیان و ئەگەری تاوانکاری و ئەنجامدانی تاوان.

٦ یاسادانەر هەم تاوانی سوالّکردن و هەم تاوانی بێلانەیی پێناسە نەکردووە.

## سێیەم: رووی جیاوازییان

چەندین لایەنی جیاواز لە نێوان ئەو دوو تاوانە هەیە، ئێمە باسی جیاوازییەکانیان بە زنجیرە دەکەین:

١ لەڕووی وەسفکردنی یاسایی بۆ هەردوو تاوانەکە

ش. س. م.

١- بڕوانە مادەی ٢٤ یەکەم / لە یاسای چاودێری نەوجەوانانی عێراقی ژمارە ٧٦ی سالّی ١٩٨٣، وەک هەموار کراوە، کە تێیدا هاتووە هەر کە منداڵێکی کەم تەمەن یان نەوجەوان بە بێ ماڵ و حاڵ دادەنرێت، ئەگەر لە شوێنە گشتییەکاندا سوالّ بکات، برینداربوون یان کەمئەندامی پیشان بدات، یان فێڵکردن وەک ئامرازێک بەکاربهێنێت بۆ بەدەستهێنانی هاوسۆزی خەڵک بە مەبەستی سوالّکردن.

بە گـــوێرەی برگەکـــانی ٣٩٠ و ٣٩١ و ٣٩٢ ی یاســـای ســـزدان سـوالّکردنی بە تـاوان دانـاوە، بەلاّم یاسـادانەر بێلانەیـی بە تـاوان دانەنـاوە، بەڵکو بە نەنگییەکی (عیـب) کۆمەلاّیەتی هەژمـاریکردووە، کە پێویستی بە سەرپەرشتی و چاودێری هەیە، زۆربەی یاساکان لەسـەر ئەمە رۆیشتوون. لە دەقی مادەی ٢٨ی یاسای چاودێری نەوجەوانـان هـاتووە: (بە پێـی راپـۆرتی پێشکەشـکراو لەلایەن بەرێـوەبەری خـانەی نەوجەوانان یان لەسەر خواستی خودی نەوجەوانەکە یـان خزموکەسـی یـان کەسـی پەروەردەکـاری، دادگـای نەوجەوانـان بـۆی هەیە چـاو بەو بریارە بگێڕێتەوە، کە بەپێی مادەی ٢٦ی ئەم یاسایە دەرچووە، یـان بە گـوێرەی بەرژەوەنـدی منـاڵەکە یاسـاکە هەمـوار بکـاتەوە)، ئەو بریـاری چاوخشاندنەوەیە بەو بریارەی کە دادگا دەریکردووە، تەنها دەرهەق بە بێلانەکەیە، نەوەک دەرهەق بە تاوانی سوالّکردن بێت[1].

ش. س. م.

١- سەیری مادەی: ٢٤ یەکەم و دووەمی یاسای چاودێری نەوجەوانانی عێراقی بـکە ژمـارە ٧٦ ی سـاڵی ١٩٨٣ی هەمـوارکراو، کە دەڵـێ: منـاڵ بە بـێلانە دەژمێردرێت ئەگەر بینرا:

أ- لە شوێنی گشتی سوالّی دەکرد یان خۆی وەک بریندار یان کەمئەندام پیشاندا، یان فرتوفێڵی بۆ بەدەستهێنانی سۆزی خەڵک بەکارهێنا.

ب- دەستگیر و دەستفرۆشی بکات یان بۆیاخی پێلاو بکات، یان جگەرە بفرۆشێ، یان هەر پیشەیەکی تر کە رووبەرووی تاوانکاری بکاتەوە و تەمەنی لە ١٥ سـاڵ کەمتر بێت.

ج- شوێنی نیشتەجێبوونی دیاریکراوی نەبووە یان شوێنە گشتیەکانی وەک پەناگەی خۆی وەرگرتووە.

د - ئامرازێکی شەرعی ژیانی نەبووە و سەرپەرشتیاری و دایکوباوکێکی نەبووە.

هـ - بەبێ پاساوێکی رەوا ماڵی باوکی یان شوێنی حەوانەوەی جێهێشتبێ.

٢- منداڵی خوار تەمەنی یاسایی بە بێلانە دادەنرێت، ئەگەر هەر پیشـەیەک ئەنجام بدات یان لەگەڵ کەسی تر جگە لە دایک و باوکی کار بکات.

٢ لەرووی سزاکەوە

یاسادانەری عێراقی سوالّکردنی بە تاوان داناوە و سزاشی بۆ ئەنجامدەرانی داناوە، کە ئەویش بریتییە لە بەندکردنی بۆ ماوەیەک کە لە مانگێک کەمتر نەبێت و لە سێ مانگیش زیاتر نەبێت، حوکمەکانی بەرپرسیاریتی نەوجەوان بەسەر کردەی سوالّ دەسەپێ[١]، ئەگەر نەوجەوانەکە سوالّی کرد[٢]. کەچی نابینین یاسادانەر سزای بێلانە بدات، بەلّکو دادگا بریار دەدات، بەگوێرەی بەلّێنامەیەکی دارایی منالّەکە یان هەرزەکارەکە بە باوانی یان کەس و کاری یان سەرپەرشتیکاری بدرێتەوە[٣].

٣ لەرووی سەختی بارودۆخەوە

دەبینین کە یاسادانەر سزای توندی بەسەر سوالّکەردا سەپاندووە، کە دەگاتە کەمتر لە سالّێک بەندکردن، ئەگەر سوالّکەرەکە وا خۆی نیشاندا، کە برینـدارە یان لەکەیەکی هەیە یان هەر هۆکارێکی دیکە بەکاربێنێ، تاکو هەست و سۆزی خەلّک بەدەستبێنێ، ئەوانیش خێری پێ بکەن، یان برین و کەمئەندامی خۆی بۆ پارانەوە پیشان بدات[٤]. کەچی هیچ شوێنەوارێکی سزای توند دەرهەق بە کەسی بێلانە نابینین، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە یاسادانەر کەسی بێلانە سزا نادات.

---

ش. س. م.

١- جعفر یاسین، التشرد وانحراف سلوک الصغار، مصدر السابق، ص١٣٨.

٢- سەیری مادەکانی ٢،١/٣٩٠، لە یاسای العقوبات العراقییە رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

٣- سەیری مادەکانی یەک و دوو و سێ و چواری یاسای چاودێری کۆمەلایەتی عێراق ژمارە ٧٦ی ١٩٨٣ بکە.

٤- سەیری مادەی ١/٣٩٠ لە یاسای سزادانی عێراقی سالی ١٩٦٩ بکە.

## لقی دووەم
## جیاکردنەوەی لە تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ

تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ، بە تاوانێکی دژ بە مرۆڤایەتی و دژ بە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دادەنرێت، چونکە بە پێشێلکردنی گرنگترین مافی هاولاتیان دادەنرێت، ئەم پرسە بە گوێرەی رێککەوتن و بەڵێننامە نێودەوڵەتییەکانی چارەسەرکراوە[1]. ئەو تاوانبارانەی کە بازرگانی بە مرۆڤەوە دەکەن و مافەکانی مرۆڤ پێشێل دەکەن ئەو مافانەی، کە پەیوەندییان بە ئازادی و کەرامەتی مرۆڤەوە هەیە، لە ئەنجامدا گروپێک دروست دەبێت، کە ستەمی لێدەکرێت و دەکرێت بە کۆیلە، چونکە ئەوان ئەو مرۆڤەی کە خودای گەورە رێزی لێ گرتووە، گۆڕیوە بۆ کالایەک کە تەنها بەخراپترین شێوە بکڕدرێت و بفرۆشرێت، مرۆڤ لەمیانەی ئەمەدا تووشی ئازاردانی جەستەیی و دەروونی دەبێتەوە. ئەم بازرگانییە لە دوای بازرگانی چەک و مادده هۆشبەرەکان، بە پلەی دووەم دێت، بەو پێیەی ئەم قازانجانە دەگوازرێنەوە بۆ چەندین چالاکیی تاوانکاری دیکە[2]، بۆیە یاسای عەرەبی و نێودەوڵەتی و پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان[3] بە ئاراستەی چارەسەرکردنی هەنگاویان ناوە. لێرە

---

ش. س. م.

١- احمد عبد القادر خلف, مصدر سابق، ص ٦٨

٢-غصن مناحي خيون, جريمة الاتجار بالبشر في التشريع العراقي والمقارن, رسالة ماجستير, كلية القانون والعلوم السياسية, جامعة البصرة ٢٠١٢, ص٢٩.

٣- الاتفاقية الأوربية لمكافحة الاتجار بالبشر لعام ٢٠٠٥ وبرتوكول منع وقمع ومعاقبة الوطنية الاتجار بالبشر وخاصة النساء والاطفال المكمل للاتفاقية الأمم المتحدة لمكافحة الجريمة المنظمة . عبر الوطنية عام ٢٠٠٠

بەدواوە ئەو تاوانە دەناسێنین و رووە لێکچوو و جیاوازەکانی لەگەڵ تاوانی سەواڵکردن روونوەکەینەوە.

### یەکەم: پێناسەی بازرگانیرکردن بە مرۆڤ

فیقهـ بازرگانیکردن بە مرۆڤی وا پێناسە دەکات: (هەر کردەیەک یان هەڵسوکەوتێک، کە ببێتە هۆی گواستنەوەی کەسێک یان کۆمەڵە کەسێک، چ منداڵ، چ پیاو یان ژن، بن بۆ کە سانی دیکە لە بەرامبەر ئەوەی بۆ کاری سێکسی یان بازرگانیکردن بە فرۆشتنی ئەندامەکانیان یان ئیستغلالکردنیان لە بواری زانستیدا یان ئیستغلالکردنیان لە شەڕەکاندا وەک بەکرێگیراو، یان ئیستغلالکردنیان لە کاری زۆرەملێ لە پیشەسازی و کشتوکاڵدا بە شێوەیەک کە ژیانیان بخاتە مەترسییەوە، یان ئیستغلالکردنیان لە کۆچی نایاسایی، جا ئەم کارانە بە پارە یان بەبێ پارە، لەلایەن ئەوانەوە بە ویستیخۆیان ئەنجام بدرێت یان بە زۆرەملێ بێت)[1]. ئەوانی دیکە بەم شێوەیە پێناسەیان کردووە: (هەموو ئۆپەراسیۆنێک کە بە مەبەستی کڕین، فرۆشتن، یان قاچاخچێتی یان ڕفاندن یان ئیستغلالکردنی خەڵک بۆ مەبەستی کاری زۆرەملێ، خزمەتگوزاری سێکسی، یان بوارەکانی دیکەی وەک میدیا یان پۆرنۆگرافی ئەنجام بدرێت ، هاوسەرگیری بە گوێرەی خواست، یان هەر کارێکی دیکە، کە پەیوەندی بە سێکسەوە هەبێت)[2]. لە کاتێکدا هەندێکی تر بەم شێوەیە پێناسەیان کردووە: (بەسەربازگرتنی مرۆڤ، گواستنەوەیان، راگوازتنیان، داڵدەدانیان، یان پێشوازی لێکردنیان بە زۆرەملێ یان بە فریودان یان بە ڕفاندن، یان خراپ بەکارهێنانی

ش. س. م.

١- د. محمد مختار القاضي الاتجار بالبشر, دار المعرفة الجامعية, ٢٠١١, ص٦٢.

٢-د. دهام اكرم عمر، جريمة الاتجار بالبشر، دار الكتب القانونية، مصر القاهرة، ٢٠١١، ص١٢٩.

دەسەڵات، یان بە پێدانی یان وەرگرتنی بڕە پارە، یان یارمەتییەکان بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندییەک لە کەسێک کە دەسەڵات یان دەسەڵاتی دادوەری بەسەر کەسێکی تردا هەیە، یان بە هەر ئامرازێکی رەوا و نارەوا، بە ئامانجی فرۆشتنیان یان بەکارهێنانیان لەبوارەکانی سێکسی یان بێگاریی، یان کۆیلایەتی، یان هەڵسوکەوتی هاوشێوەی سواڵکەر یان کۆیلایەتی یان بازرگانیکردن بە ئەندامانی جەستەیان بۆ مەبەستی تاقیکردنەوەی پزیشکی یان بەکارهێنانیان لە هەر ئامانجێکی دیکە کە بە یاسا بە تاوان دانرابێت)[1].

یاسادانەری عێراق لە یاسای ژمارە ٢٨ی ساڵی ٢٠١٢، یاسای بازرگانیکردن بە مرۆڤی، مامەڵەی لەگەڵ بازرگانیکردن بە مرۆڤەوە دیاریکردووە کردووە، بەو پێیەی پێناسەی بازرگانیکردن بە مرۆڤەوە بەم شێوەیە کردوە: ( کۆکردنەوە، گواستنەوە، داڵدەدان، یان پێشوازیکردن لە کەسەکان لە ڕێگەی هەڕەشەکردن یان بەکارهێنانی هێز یان جۆرەکانی تری زۆرلێکردن، ڕفاندن، فریودان، یان ئیستغلالکردن دەسەڵات یان پێدان یان وەرگرتنی پارە، سوودی دارایی یان یارمەتییەکان بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی کەسێک کە دەسەڵات یان سەرپەرشتی بەسەر کەسێکی تردا هەیە بە مەبەستی فرۆشتن یان بەکارهێنانی بۆ لەشفرۆشی، کاری زۆرەملێ، کۆیلایەتی، سواڵکردن یان بازرگانیکردن بە ئەندامە مرۆییەکانیان، بۆ مەبەستی تاقیکردنەوەی پزیشکی)[2].

تێبینی ئەو دەکەین، کە ئەو پێناسەیەی کە یاسادانەری عێراقی داینەوە، وەک کۆپییەکی کتومتی ئەوەی کە لە مادەی سێیەمی پرۆتۆکۆڵی ڕێگریکردن و سەرکوتکردنی بازرگانیکردندا هاتووە،

ش. س. م.

١- غصن مناحي خيون، المصدر السابق، ص٢١.

٢- المادة ١/ أولا من قانون مكافحة الاتجار بالبشر العراقي رقم ٢٨ لسنة ٢٠١٢.

وەرگیراوە، بەتایبەتی ژنان و منداڵان، کە تەواوکەری ڕێککەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانە، لەگەڵ هەندێک هەموارکردنەوە.

دووەم: لێکچوونەکان

تاوانی سواڵکردن هاوشێوەی تاوانی بازرگانیکردنە بە مرۆڤەوە لە چەند بابەتێکدا لەوانە:

١ لە ڕووی ئامانجەوە

تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤەوە ئامانجی بەدەستهێنانی قازانجی داراییە بۆ دابینکردنی پارە بۆ چەندین چالاکیی تاوانکاری دیکە، لەکاتێکدا لە تاوانی سواڵکردندا، دەبینین مەبەستی گەورە تەنها قازانج کردنە.

٢ لەڕووی ئەو بەرژەوەندییەی کە لە بەتاوانکردندا هەیە

لە هەردوو تاوانەکەدا پاراستنی بەرژەوەندی کەرامەت و ژیانی مرۆڤ و زیان نەگەیاندن بە ماف و ئازادییەکانی لەبەرچاوی گیراوە. بەرژەوەندی یاسایی ئەو تەوەرەیە کە پاراستنی یاسایی لەسەر دەوەستێ، ئەوە کاری یاسادانەرە کە بەرژەوەندی پارێزراوی یاسایی بەو بەرژەوەندییانە بدات، کە کۆمەڵگا بە شایستەی پاراستنی دەزانێ[1]، ئەو شتە بۆ یاسادانەر جێهێڵدراوە، کە لە ژێر ڕۆشنایی سیاسەتی تاوانکاریدا ئەو بەرژوەندییە مەزەندە بکات، کە شایستەی پارێزگاری لێکردنە، هەردوو تاوانەکە بە تاوانی ترسناک هەژمار دەکرێن، کاتێک یاسادانەر ئەم کردەوانە بە تاوان دەزانێت، سەرباری ئەوەی ڕێگری دەکات لەوە ئەو بەرژەوەندییانە زیانیان پێ بگات، لەبەر ئەوەشە دەیەوێت ئەو بەرژەوەندییانە لە مەترسی بپارێزێ[2].

ش. س. م.

١- محمد مردان علي، مصدر سابق، ص ٥٠

٢- محمد مردان علي ، المصدر السابق ص ٦٤.

٣- هەردوو تاوان، تاوانی سواڵکردن و تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ، تاوانی شێوەیین[1].

٤- هەم تاوانی سواڵکردن و هەمیش تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ، تاوانی بە ئەنقەستن[2].

٥- ئەو دوو تاوانەکە، تاوانی ئەرێنین[3].

## سێیەم: ڕووی جیاوازییان

١ لەرووی پێناسەوە

یاسادانەر بەپێی برگەکانی یاسای بەرەنگاربوونەوەی بازرگانیکردن بە مرۆڤ ژمارە ٢٨ی ساڵ ٢٠١٢ (قانون مكافحة الاتجار بالبشر رقم ٢٨ لسنة ٢٠١٢)، بازرگانیکردن بە مرۆڤەوەی پێناسە کردووە، بەڵام تاوانی سواڵکردنی پێناسە نەکردووە[4].

٢ لە ڕووی مۆرکی نیشتیمانییەوە

تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤەوە زۆربەی جاران تاوانی سنوربڕ و لە تاوانە ڕێکخراوەکانە[5]، بەپێچەوانەی سواڵکردن تاوانێکە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا لە دەرەوەی سنوورەکانی دەوڵەت بۆ ناو دەوڵەت دێت و

ش. س. م.

---

١- تاوانی شێوەیی(الجريمة الشكلية): تاوانێکە کە یاسادانەر تەنها لە ڕێگەی ڕەفتارە تاوانکارییەوە دەتوانێ بناغە مادییەکەی تەواو بکات، جا ئەرێنی بێت یان نەرێنی.

٢- تاوانی بە ئەنقەست: تاوانێکە کە بناغە مەعنەوییەکەی لە مەبەستی تاوانکاری پێکدێت. بۆ زیاتر سەیری: عبد الستار البزركان مصدر سابق ص١٥٣

٣- تاوانی ئەرێنی تاوانێکە کە تێیدا ڕەفتاری توخمە ماددییەکە ئەرێنی بێت، وەک تاوانی دزی.بۆ زیاتر سەیری: د علي حسين خلف وسلطان الشاوي المبادئ العامة في قانون العقوبات، مصدر سابق.

٤- المادة ١/ أولا من قانون مكافحة الاتجار بالبشر العراقي رقم ٢٨ لسنة ٢٠١٢

٥- غصن مناحي، مصدر سابق، ص ٢٦

له هەندێ باریشدا ڕەنگە ڕێکبخروابێت وەک تاوانەکانی سوالّکردنی ئەلیکترۆنی، کە لە تۆڕە تاوانکارییەکانەوە ڕوودەدات، کە لە ئێستادا بە شێوەیەکی کاریگەر بڵاوبوونەتەوە، بەبێ ئەوەی لەلایەن دەزگا جێبەجێکارەکانەوە چاودێری بکرێن، وەک ئەوەی بۆمان دەردەکەوێت زۆر کەس لە تۆڕە کۆمەلآیەتییەکان کەیسەکانی هەندێک کەمئەندام یان ئەوانەی پێویستیان هەیە بڵاودەکەنەوە و داوای هاوکارییان بۆیان دەکەن، بەبێ ئەوەی بزانرێت کێ لەپشت ئەم حاڵەتانەوەیە، کەچی یاساکانی پاراستنی کۆمەلآیەتی و یاسای تایبەت بە خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان زۆرترین گەرەنتی ژیانی ئەوانەی کردووە، بۆیە پێویستە لەسەر دەستەی ڕاگەیاندن (هیئة الاعلام) بە هاوکاری لەگەڵ دەزگاکانی دیکەی پۆلیش چاودێری ئەو جۆرە کەیسانە بکەن.

٣ لەڕووی بوونی ڕەزامەندییەوە

له تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ ڕەزامەندی بوونی نییە، بەو پێیەی قوربانییەکە ئازادی هەڵبژاردنی لێ زەوت دەکرێت، بە بەکارهێنانی هەڕەشە و هێز، یان بە بەکارهێنانی فێڵ و فریودان، بۆیە تاوانلێکراوە دەبێتە نێچیری تاوانبارەکە، بەڵام لە تاوانی سوالّکردندا، تاوان لێکراو ڕەزامەندی لەسەر کارەکە هەیە، بە ویستی خۆی پارە بە تاوانبار دەدات، بەبێ ئەوەی فشاری لەسەر بێت و زۆری لێکرابێت.

٤ له ڕووی سزاوە:

تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ سزای زیندانیکردنە، لە هەمان کاتدا سوالّکردن سزای تاوانبارەکە زیندانیکردنە[1].

٥ لەڕووی کەسەکانەوە:

تاوانی سوالّکردن زیاتر لەلایەن کەسانی سروشت ئادەمی و ئاساییەوە ئەنجام دەدرێت، کەچی تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤ ڕەنگە

ش. س. م.

١- سەیری مادەی: المادة ٣٩٠/١ قانون العقوبات العراقي

کەسێکی سروشتی بێت یان ڕەنگە لەلایەن قەوارە یاساییەکانی وەک کۆمپانیا، ڕێکخراوی خێرخوازی یان هەر ڕێکخراوێک بێت، ئەم تاوانە بەناوی ئەو دامەزراوانە و بۆ حسابی ئەوان ئەنجام دەدرێت، وەک بەرپرسیاریتی کەسی یاسایی مەعنەوی بەرپرسیارێتییەکی ڕاستەوخۆیە[1].

٦ لەڕووی هەبوونی بارودۆخی توندکردنی سزا

لە ئەگەری بوونی بارودۆخی توندکردنی سزا لە تاوانی سواڵکردندا، وەک چەند بارەکردنەوەی ئەم تاوانە، واتا کردۆیەتی بە پیشەی خۆی، یاسادانەری عێراقی سزای زیندانیکردنی بۆ ماوەیەک داناوە، کە لە ساڵێک زیاتر نەبێت، بە پێچەوانەی تاوانی بازرگانیکردن بە مرۆڤەوە، کە سزای لەسێدارەدانی هەیە، ئەگەر ئەو کارە ببێتە هۆی مردنی قوربانییەکە.

## لقی سێیەم
## جیاکردنەوە لە تاوانی هەڵخەڵەتاندن

تاوانی خەڵەتاندن یەکێکە لەو تاوانانەی بۆ پارە ئەنجام دەدرێت، ئەمەش کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا دەبێت لە ڕوانگەی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە، بەو پێیەی بڵاوبوونەوەی دەبێتە هۆی نەبوونی متمانە لە نێوان خەڵک و نەبوونی متمانە لە مامەڵەکردندا، بەتایبەتی کە کۆمەڵگەی ئیسلامی کۆمەڵگەیەکی میهرەبان و لێبوردە و جێی متمانەیە، ئەمەش وا دەکات کە تووشی ساختەکاری بێت، جگە لە بەکارهێنانی شێوازی تاوانکاری لەلایەن تاوانبارانەوە. بۆیە یەک لەدوای یەک باسی پێناسەی تاوانی خەڵەتاندن دەکەین، دواتر باسی لێکچوونەکانیان دەکەین، پاشان جیاوازییەکان.

ش. س. م.

١- غصن مناحي خيون، مصدر السابق، ص٩٥ و٩٥٦.

### یەکەم: پێناسەکردنی تاوانی هەڵخەڵەتاندن

بە شێم لە فەقیهەکان خەڵەتاندنیان بەم شێوەیە پێناسە کردوە: (دەستبەسەراگرتنی پارەی جوڵاوی کەسانی دیکە، لە ڕێگەی خەڵەتاندنیانەوە). * هەندێکی تر بەو شێوەیە پێناسەیان کردووە: (دەستبەسەراگرتنی پارەی جوڵاوی کەسانی دیکە، لە ڕێگەی خەڵەتاندنیان و ناچارکردنیان بۆ رادەستکردنی ئەو پارەیە). هی دیکەش وایان پێناسەکردووە: (ساختەچییەکە ئامرازێک لە ئامرازەکانی فرتوفێڵکردن بەکاردێنێ، فێڵ لێکراوەکە ناچار دەکات پارەی پێ بدات، بەمەش تاوانبار پارەیەک دەستدەخات هی خۆی نییە)[1]. هەڵوێستی یاسادانەری عێراق ئەوەیە کە ئاماژەی بە پێناسەیەکی دیاریکراو نەکردووە بۆ تاوانی خەڵەتاندن، بەڵکو لە چوارچێوەی بڕگەکانی یاسای سزادانی هەموارکراوی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ مامەڵەی لەگەڵدا کردووە، وەک ئەوەی لە مادەی ٤٥٦ تێیدا هاتووە: (بە گرتن سزا دەدرێ، ئەوەی گەیشتنە وەرگرتنی ماڵێکی گوێزراوە یان کواستنەوەی دەستداری ماڵێکی گوازراوەی یەکێکی دیکە بۆ خۆی کردبێ، یان بۆ دەستداری یەکێکی دیکە، بەیەکێک لە ڕێگایانەی خوارەوە:

أ -بەکارهێنانی ڕێگا فێڵکارییەکان.

ب - بەکارهێنانی ناوێکی ساختە یان سیفاتێکی هەڵە، یان باسکردنی بابەتێکی درۆ سەبارەت بە ڕووداوێکی دیاریکراو، هەرکاتێک ئەمە فیڵ لێکراو فریو بدات و ناچاری بکات پارەی خۆی ڕادەست بکات[2].

---

ش. س. م.

١- د نظام توفيق المجالي شرح قانون العقوبات القسم العام مصدر سابق، ص ٢١٤

٢- ينظر المادة ٤٥٦/١١ ب من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل.

یاسـادانەری عێراقـی روون و ڕەوان بـووە لە پاراسـتنی موڵـک وماڵی جوڵاو، وایکرددووە کە بابەتی فێڵ لێکراو چ پارە بێت یان شتێک بێت بەهـای هەبێت، ئەوەی بەهـای دارایـی هەیە، دەتوانرێت بە پـارە بخەملێندرێت[1].

بە لەبەرچـاوگرتنی ئەوەی کە پـارەی گواسـتراو هـی کەسـێکی دیکەیە، تاوانبـار خـاوەنی پارەکە نییە، یـان مـافی مـامەڵەکردنی پێوەی نییە، لەم حاڵەتەدا تۆمەتبار لە هیچ کاتێکدا خاوەنی پارەکە نەبووە، یان خاوەنی بوو دواتر خاوەنداریتییەکەی لەدەستداوە.

### سووەم: ڕووی لێکچوونەکانیان

لێکچوون لە نێوان تـاوانی خەڵەتانـدن و تـاوانی سـواڵکردنـدا هەیە ، وەک ئەمانەی خوارەوە:

١ لەڕووی ئامانجەوە: هەردوو تاوانەکە مەبەست لێی ئەنجامدانی قـازانجە، هەرچەنـدە تـاوانی سـواڵکردن لە تـاوانی سـاختەکاریدا، ناگـاتە ئاسـتی قـازانج، بەڵام سـواڵکردنی ئەلیکترۆنـی لە ڕێـگەی کـۆمەڵە و ڕێکخراوەکـانەوە، گەورەتـرین ڕۆڵـی هەیە لە بەدەسـتهێنانی زۆرێـک و قـازانجێکی زۆر، چـونکە لەلایەن تـۆڕە تاوانکـارییە تایبەتمەنـدەکانەوە بەڕێوەدەبرێت.

٢ لەڕووی ڕادەسـتکردنەوە: لە هەردوو تـاوانەکەدا، قوربـانی خۆبەخشـانە پـارەکە ڕادەسـتی تاوانبـار دەکـات، چـونکە جەوهەری ساختەکاری بریتییە لە شێواندنی ڕاستییەکان لە مێشکی قوربانییەکەدا لەلایەن تاوانبارەوە، ئەمەش وای لێدەکات بەو کارە رازی بێت[2].

ش. س. م.

١- د. فخري عبد الرزاق الحديثي شرح قانون العقوبات القسم الخاص ٢ مطبعة الزمان ١٩٩٦ ص ٣٨٨.

٢- د ماهر عبد شويش شرح قانون العقوبات القسم الخاص مصدر, سابق ص٣٣٢ . وينظر : كذلك نصر شومان جريمه الاحتيال مصدر سابق ص١٥

٣ لەڕووی هەندێک تایبەتمەندی: کە هەردوو تاوانەکە تاوانی ئەرێنین، کە تەنها بە کردەیەکی ئەرێنی دەتوانێت ڕووبدات، هەروەها بە تاوانی بە ئەنقەست دادەنرێت، بەو پێیەی مەبەستی تاوانکاری دەبێت بوونی هەبێت، واتە ئاراستەی نیازی تاوانبار بۆ کردەوەی ساختەکارییەکەی، ئەوەیە بە وەرگرتن یان گواستنەوەی پارەیەک بگات، کە ئەو خاوەنی نییە[1].

٤ سەبارەت بە بابەتی دەستدرێژیی: هەردوو تاوانەکە تەنها لەسەر ماڵی گوزراوە ڕوودەدەن.

٥ لەڕووی گۆڕینی حەقیقەتەوە: تاوانی سواڵکردن زیاتر لەسەر بەکارهێنانی شێوازی فێڵ و فریودان دامەزراوە، کە سواڵکەرەکە بەکاریدەهێنێت، کەچی تاوانی ساختەکاریش لەسەر بنەمای بەکارهێنانی فێڵکردنە، بەو پێیەی دەبێتە هۆی شێواندنی ڕاستییەکان لە مێشکی فێڵ لێکراو، ئەمەش بە ویستی خۆی پارە رادەستی فێڵکەرەکە بکات.

## سێیەم: ڕووە جیاوازیەکان

لە نێوان تاوانی سواڵکردن و تاوانی ساختەکاریدا جیاوازی هەیە و ئێمەش خوارەوە باسی ئەوە دەکەین.

١ لە ڕووی سروشتی یاساییەوە: تاوانی سواڵکردن یەکێکە لە تاوانە کۆمەڵایەتیەکان، لەکاتێکدا تاوانی ساختەکاری یەکێکە لە تاوانەکانی دەستدرێژکردنە سەر ماڵی ئەوانی دیکە[2].

ش. س. م.

١- د واثبة السعدي شرح قانون العقوبات القسم الخاص بغداد ١٩٨٨, ص ٢١٧ ٢

٢- المادة ٣٩٠ والمادة ٤٥٦ من قانون العقوبات العراقي، بە دەق هاتووە: (هەر کەسێک بگاتە کاری یان گواستنەوەی خاوەندارێتی موڵکی جوڵاو بۆ خۆی یان بۆ کەسانی دیکە بکات/سزا دەدرێت بە زیندانیکردن، لە ڕێگەی ئەم ڕێگایانەی خوارەوە: أ- بەکارهێنانی شێوازی ساختە. بە وەرگرتنی ناوێکی درۆ یان سیفاتێکی نادروست، یان لێدوانێکی درۆ سەبارەت بە ڕووداوێکی دیاریکراو، هەرکاتێک کە ئەوە ببێتە هۆی فریودان.

٢ له ڕووی ئیرادەی ئازادی تاوان لێکراو: له تاوانی سواڵکردندا ئیرادەی تاوان لێکراو ئازاد و بێ پەڵەیه، کەچی له تاوانی ساختەکاریدا ئیرادەی تاوان لێکراو، بەهۆی کەموکوڕی ساختەکارییەوە، لەنگ دەبێت[١].

٣ له ڕووی بوونی مەبەستی تایبەت: له تاوانی سواڵکردندا پێویستی به بوونی نیەتی تاوانی تایبەت نییه، بەڵکو مەبەستی گشتی بەسه بۆ گەیشتن به تاوانەکه، به پێچەوانەی تاوانی خەڵەتاندنه، وەک ئەوەی پێویستی بەوە هەیه تاوانبار به تایبەت نیەتی بردنی پارەیەک بێت، که هی کەسانی دیکەیه.

٤ لەڕووی رادەستکردنەوە:

گەیاندن یەکێکه له پایەکانی تاوانی خەڵەتاندن، بەپێچەوانەی تاوانی سواڵکردنەوە، یاسای نەیکردۆته مەرج.

٥ له رووی دەستپێکردنەوە:

له تاوانی سواڵکردندا دەستپێکردن نییه، چونکه له یاسای عێراقی به سەرپێچی دانراوە له تاوانه شێوەییەکانیشه، به پێچەوانەی تاوانی فێڵکردن که دەستپێکردنی (الشروع) تێدایه، بەڵکو هەرکه فێڵباز دەستی بەکارەکەی کرد، راستەوخۆ چۆته ناو بابەتی تاوانەکەوە و ئامانجی لێی بەدەستهێنانی پارەی فێڵ لێکراوەکەیه.

٦ لەرووی سزاوە:

یاسادانەر ماوەی کەمترین و زۆرترین سزا بۆ تاوانی سواڵکردن دیاری دەکات. به پێچەوانەی تاوانی ساختەکاری، کەمترین سزای دیاری نەکرد بەڵکو دەسەڵاتی مەزەندەکردنی سزاکەی به دادوەر داوە[٢].

ش. س. م.

١- د. ماهر عبد شويش شرح قانون العقوبات القسم الخاص مصدر سابق ص٣٣٢

٢- سەیری :المادة ٣٩٠/١ والمادة ٤٥٦ من قانون العقوبات العراقي، هەروەها سەیری: مادەی ٨٩ی هەمان یاسا بکە، که دەڵێت: زیندانیکردنی سادە بریتییه له دانانی تاوانبار له یەکێک لەو شوێنه سزایانەی که یاسا بۆ ئەو مەبەسته دیاریی

٧ لەرووی ئەنجامی تاوانکاریی:

گەیشتن بە ئەنجامی تاوانکاری لە تاوانی سوالکردندا پێویست ناکات، چونکە تاوانەکە تاوانێکی مەترسیدارە، بەو پێیەی بە تاوانێکی شکلی دادەنرێت،لەبەرئەوەی هەرکاتێک کردارەکە ڕوویدا ئەنجاممان دەستدەکەوێ، بە پێچەوانەی تاوانی خەڵەتاندنەوە، مەرجی ئەوەیە پێویست دەکات رەگەزەکانی چالاکیی تاوانکاری لە کردەوەی ساختەکاری و ئەنجامی تاوانکارییەوە بوونیان هەبێت، کە ئەویش بریتییە لە رادەستکردنی پارەکە، پەیوەندییەکی هۆکاریی هەیە لەنێوان کردەوە و ئەنجامەکەی، مەرجە ئەنجامی کارەکە بێتەدی، کە ئەویش رادەستکردنی پارەیە، ئەو رادەستکردنەش بریار وایە لە دەستی فێڵ لێکراوە بۆ دەستی فێڵکەرەکە بێت.

---

کردووە، بۆ ئەو ماوەیەی لە سزاکەدا دیاری کراوە، کە لە بیست و چوار کاتژمێر کەمتر نەبێت و لە ساڵێک زیاتر نەبێت، مەگەر یاسا بە پێچەوانەوە دیاری بکات ... هەروەها لە مادەی ٨٨ی هەمان یاسادا بە وریایی زۆر دیاری کراوە، ئەویش دانانی سزادراوە لە دامەزراوەی سزاییەکان بۆ ماوەی کەمتر لە سێ مانگ و لە پێنج ساڵ زیاتر نەبێت، مەگەر بە پێچەوانەوە دیاری نەکرابێت.

# بەشی دووەم

# حوکمە بابەتییەکان و ئەنجامی کاریگەرییەکانی تاوانی سواڵکردن

لەم بەشەدا و لە باسی یەکەمدا باس لە پایە گشتییەکانی تاوانەکە دەکەین بەپێی دوو داواکاری: یەکەمیان پایە ماددییەکەی تاوانەکە و دووەمیان تەرخان دەکەین بۆ پایە مەعنەوییەکەی، بەهۆی ئەوەی تاوانەکە تاوانێکی بە مەبەستە، لە بەشی دووەمدا باس لە دەرئەنجامی کاریگەرییەکانی تاوانی سواڵکردن دەکەین و لە دوو تەوەرا مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین: لە یەکەمیان باسی سزای ئەنجامدەری تاوانی سواڵکردن دەکەین، دووەمدا باس لە تاکێتی سزاکە دەکەین.

# باسی یەکەم
# پایە گشتییەکانی تاوانی سواڵکردن

پایەکانی تاوان یان گشتین، هەموو تاوانەکان دەکەونە ژێر بازنەی ئەو تاوانە، لەوانەشە تاوانەکە جگە لە پایە گشتییەکانی یان پایەی تایبەتیشی دەبێت، کە لە تاوانەکانی دیکە جیای بکاتەوە، ئەگەر ئەو پایە گشتیانەی لەدەستدا، ئەوا ئیدی بە تاوان نامێنێتەوە[1]، پایە گشتییەکان ئەو پایانەن کە هەموو تاوان تێیدا هاوبەشن، هەرچی پایەی تایبەتمەندە، ئەوا تاوانەکەی پێ دەناسرێتەوە و لە تاوانی دیکەی جیای دەکاتەوە[2]، پایەی تایبەتی خۆی لە سیفەتێکی تاوانبار یان تاوان لێکراو دەبینێتەوە یان خۆی لە کات و شوێنی تاوانەکە دەنوێنێ[3].

لەمەدا یاساکان بە دوو ئاراستەدا ڕۆیشتوون: ئاراستەی یەکەم کە تاوان دوو پایەی هەیە، ئەوانیش پایەی ماددی و پایەی مەعنەوی، وەک لە یاسای عێراقدا هەیە، وەک چۆن لە لە یاسای سزادان لە مادەکانی ٢٨-٣٨، بە دوو پایە تاوانی دیاریکردووە: پایەی ماددی و مەعنەوی، یاسادانەر سەرکەوتوو بوو لە دیاریکردنی پایە گشتییەکان، بەو پێیەی تاوان لە ڕێگەی پایە گشتییەکانەوە نەبێت ڕوونادات، بۆ ئەوەی یاسادانەر دەستێوەردان بکات بۆ پاراستنی بەرژەوەندی کە لە ڕێگای

ش. س. م.

١- د. نظام توفيق المجالي مصدر سابق, ص٤١.

٢- د علي عبد القادر القهوجي شرح قانون العقوبات العام القسم العام نظرية الجريمة, منشورات الحلبي الحقوقية, بيروت, ٢٠١١, ص ٥٠.

٣- د. فخري عبد الرزاق الحديثي, شرح قانون العقوبات القسم العام, مصدر سابق ص١٨.

پاراستنەکەی بەدەستهاتووە، ئاراستەی دووەم باوەری وایە، تاوان سێ پایەی هەیە: پایەی ماددی و مەعنەوی و پایەی یاسایی، لەوانەش یاساداناني ئوردنی ئەو سێ پایەی بۆ تاوان دیاریکردووە[1]، ئێمە پێمان وایە یاسادانەری ئوردن سەرکەوتوو نەبووە لە زیادکردنی پایەی یاسایی، چونکە ئەصڵ وایە بگوترێت: (هیچ تاوان و سزایەک، بەبێ دەقێکی قانوونی بوونی نییە). بەم شێوەیە جێبەجێکردنی پایە گشتییەکان، بنەمایەکە بۆ هاندانی یاسادانەر بۆ ئەوەی هەنگاو بنێت بەرەو پاراستنی ئەو بەرژەوەندییەی کە بریاری پاراستنی دراوە، سەبارەت بە یاسادانەری میسریش لە پێناسەکردنی پایەکانی تاوانەکەدا بە هیچ ئاراستەیەکدا نەڕۆیشتووە، بەشێک لە فیقهـ سێ پایەیان بۆ تاوان دیاریکرد: پایەی یاسایی و ماددی و مەعنەوی، پایە شەرعییەکە سیفەتێکی نارەوای ئەو کردەیە، کە یاسادانەر دایدەرێژێ لەسەری[2]، پایەی ماددییش خۆی لە شتە ماددییەکانی تاوانەکە دەنوێنێ، لە کاتێکدا پایە مەعنەوییەکە خۆی لەو ئیرادەیە دەنوێنێ کە بە کردەوەکە پەیوەستە[3]. بۆیە ئەم باسە دابەش دەکەین لەسەر دوو تەوەر: یەکەمیان بۆ پایەی مادی تاوانەکە و دووەمیش تەرخان دەکەین بۆ پایەی مەعنەوی تاوان.

ش. س. م.

١- د. محروس نصار الهيتي، النتيجة الجرمية في قانون العقوبات الطبعة الأولى منشورات زين الحقوقية. ٢٠١١،١٤،

٢- د. محمود نجيب حسني، أسباب الإباحة في التشريعات العربية النظرية العامة للإباحة من القاهرة ١٩٦٢، ص ٢

٣- د. ناديه مصطفى حسين، المسؤولية الجنائية للمتسول دار المسلمة . بغداء ٢٠٢٣، ص٦٥

# تەوەری یەکەم
# پایەی ماددی

تاوان بوونی نابێت، ئەگەر چالاکیی ماددی دەرەکی بوونی نەبێت، بیرۆکەکان ئەگەرچی شەڕانگێزیش بن و لە دەرووندا چەسپاو بن و ئیرادەیەکیش بۆ تەواوکردنیان هەبێت، بەڵام تا ئەو کاتەی داماڵدراو بمێننەوە و نێتە بەرچاوان بە تاوان نازانرێن، چونکە یاسا کار لەسەر نیاز ناکات، بۆیە بەبێ پایەی ماددی، هیچ تاوانێک بوونی نییە[1]. پایە ماددییەکە جیاوازە لە تاوانێکەوە بۆ تاوانێکی تر، بەڵام ئەو پایە مادیە دەبێت ڕواڵەتێکی دەرەکی هەبێت، بۆیە پایە ماددییەکە ماتریاڵی تاوانەکەیە، واتە سروشتی ماددی بە هەستەوەرەکان هەستی پێدەکرێت[2]، وەک پایە ماددییەکە گرنگییەکی زۆری هەیە، بەهۆی پێدانی بنەماکانی تاوانبارکردن و پاراستنی ئازادییەکان، هەروەها ڕۆڵی هەیە لە بناغەکانی سەلماندنی تاوان، لەبەرئەوەی هیچ سزایەک بەبێ بڕیاری دادوەری بوونی نییە، کە ئەو بڕیارە لەسەر بنەمای سەلماندنی ڕوودانی ڕەفتاری تاوانکارییە دەدرێت، ئەمەش بەبێ بوونێکی ماددی ڕوونادات[3]، بۆیە پایە ماددیی لە مادیاتی تاوانەکەی یان مادیاتی کردەوەکەیە، ئەوەش وادەکات سزاکە کەرت بکرێت، کە خۆی لە سزا یان گرتنەبەری

ش. س. م.

١- د. اشرف توفيق شمس شرح قانون العقوبات / القسم العام النظرية العامة للجريمة والعقوبة ٢٠١٢ ص ٦٩.

٢- د محمود نجيب حسني شرح قانون العقوبات القسم العام, ط٣ دار النهضة العربية ١٩٧٣ ص٢٧٩

٣- د. اشرف توفيق شمس, المصدر السابق ص ٧٠-٧١. ٦

ڕێوشوێنی خۆپارێزی دەنوێنێ[1]. فیقهـ پایەی ماددی بەم شێوەیە پێناسە دەکـات: (ئەو ڕووداوەیە کە لەمیـانەیەوە تـاوانەکە دەردەکەوێ و پانتاییەک داگیر دەکات و دێتەرچاوانیش)[2]. سزا تەنها و تەنها دەچێتە سـەر ئەو چـالاکییەی کە دەکرێـت لە کـۆمەڵگەی دەرەکـی هەسـتی پـێ بکرێت، یاسادانەری عێراقی لە دەروازەی سێیەم لە بەسی سێیەم لە لقی یەکەم پایە ماددییەکەی بەمشێوەیە پێناسە کردووە، بەمەش لە ڕێبازی زۆربەی یاسـاکان دەردەچێـت و دەڵێـت: (ڕەفتـارێکی تاوانکـاریی بە ئەنجامدانی کردەوەیەک کە یاسا بە تاوانی داناوە یان نەکردنی کارێک کە یاسا ئەمریکردووە بکرێت، دێتەدی[3]). ئەم تەوەرە لە سێ لقدا باس دەکەیـن یەکەمیـان بـۆ ڕەفتـاری تاوانکـاری، دووەمیـان بـۆ ئەنجـامی تاوانکاری، سێیەمیشیان بۆ ڕوونکردنەوەی پەیوەندیی هۆکاریی نێوان ڕەفتاری تاوان و دەرەنجامی کردەوەکە، بەمشێوەی خوارەوە:

## لقی یەکەم
## ڕەفتاری تاوانکاری (کردەی تاوانکاری)

ئەو ڕەفتارانەی کە بە یاسا دیاری نەکراون، ڕەفتـاری سروشـتی و ئاسـایی مرۆڤەکـانن، هـیچ شـوەێنەوارێکی یاسـاییان نابێـت، بەڵام هەر ڕەفتارێک کە لە ڕووی یاساییەوە وا وەسفکرا، کە (ڕەفتارێکی لە خودی خۆیدا نارەوایە، یان بەهۆی ئەوەی ئەو ڕەفتـارە دەسـتدرێژییە بۆ سـەر

ش. س. م. ـــــــــــــــــــ

١- د. متولي صالح شاكر تعريف الجريمة وأركانها من وجهة نظر مستحدثة دار الكتب القانونية القاهرة، ص ١٤٥ السنة ٢٠٠٣.

٢- عبد الستار البزركان، مصدر سابق ص٥٤.

٣- المادة ٢٨ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

بەرژەوەندییەک کە یاسا پاراستوویەتی)[1]. ڕەفتار چالاکییەکە کە پێش بوونی یاسا دێت و لە ئیرادەی تاوانبارەوە سەرچاوە دەگرێت، و هیچ پەیوەندی بە ئیرادەی یاساوە نییە، بۆیە ڕەفتاری تاوانکاریی بە جۆرێک لە چالاکی جیاواز لە سروشتی ڕەفتاری ئاسایی مرۆڤ نازانرێت، بە شتێک وا پێناسەیان کردووە: (هەر ڕەفتارێک مرۆڤ ئەنجامی بدات، چ ئەرێنی بێت یان نەرێنی بێت)[2]، بەڵام یاسادانەری سزایی (المشرع الجزائي) گرنگی بە هیچ ڕەفتارێک نادات، بەڵکو تەنها گرنگی بەو ڕەفتارە تاوانکارییەی دەدات، کە پێچەوانەی بڕگەکانی یاسایە و تاوانبارەکە بۆ مەبەستی تاوانکاریی لە هەندێک بارودۆخدا ئەنجامیان دەدات، ڕەنگە کردەوەکە ئەرێنی یان نەرێنی بێت. کردەی ئەرێنی جولەیەکی ئۆرگانی ویستراوە، لەسەر دوو رەگەز بەندە، ئەوانیش:

١ ئەو جوڵە ئۆرگانییەی تاوانبار بۆ گەیشتن بە ئەنجامەکە دەیگرێتەبەر.

٢ صیفەتی ویست، هەروەک چۆن دەبێت کردارەکە ویستی لەگەڵ بێت و ئەگەر تاوانبار ئیرادە و کۆنترۆڵی خۆی لەدەست بدات، کردەوەکەی شیاوی ئەوە نییە، ببێتە کردەوەیەکی تاوانکاری[3]، چونکە تاوانەکە بەبێ ڕەفتار بوونی نییە، بۆیە یاسا تەنها لەسەر نیازمەندی و حەزی مرۆڤ سزا نابڕێتەوە.

ش. س. م.

١- د جلال ثروت، نظم القسم العام قانون العقوبات نظرية الجريمة دار الجامعة الجديدة, الاسكندرية,٢٠١٠, ص ١٤٧.

٢- د. محمد صبحي نجم شرح قانون العقوبات / القسم العام النظرية العامة للجريمة دار الثقافة للتوزيع والنشر, عمان, ٢٠٠٨, ص ٢٠٨.

٣- د. اشرف توفيق شمس شرح قانون العقوبات / القسم العام النظرية العامة للجريمة والعقوبة مصدر سابق ص ٧٢.

سـەبارەت بە یاسـادانەری عێـراق، ئەوا وای پێناسـەی کـردووە: (هەمـوو رەفتارێک کە یاساکە بە تـاوانی دانـابێ، جـا ئەرێنـی بێت یـان نەرێنی، وەک کردن و نەکردن، مەگەر دەقێک هەبێت بە پێچەوانەوەی ئەمە بێـت)[1]، یاسـادانەر تەنهـا رەوایەتـی و نـارەوایەتی دەخـاتە سـەرکردەوە کـردەوەکە، چـونکە هەر ڕووداوێـک ئەگەر سـیفەتی کـردەوەی نەبـوو، شـیاوی تاوانبـارکردن نیـیە[2]. یاسـادانەری عێـراق و یاسـادانەری میسـر هـاورابوون لە تاوانبـارکردنی سـواڵکردن و تاوانبارکردنی ئەو کردەوەیەی کە پایەی ماددی تاوانە پێکدێنن، کە پێی دەگوترێت سواڵکەر[3] . لە کاتێکدا یاسادانەری ئوردنی ئەو ڕەفتارەی کە بە داواکاری خێرخوازی یان سواڵکردن لە خەڵکەوە بەندە بە تاوان زانی و دووبارە گەڕایەوە بۆ وشەی سواڵکەر، کاتێک ئامـاژەی بە ڕەفتـاری تاوانکاریی کرد ناوی سـواڵکەر و داواکەری خێری تێکەڵ کرد[4]. تـاوانی سـواڵکردن یەکێکە لە تـاوانە ئەرێنییەکـان و ناتوانرێت بە کردەوەیەکـی نەرێنی یـان بە ڕێگریکـردن ڕووبـدات، ئەمەش لەلایەن دادگـای نەقضـی میسرەوە پشتڕاست کراوەتەوە، کە تاوانی سواڵکردن (دێتەدی تەنهـا بە دەسـتگیرکردنی ئەو کەسـە لەکـاتی ئەنجامـدانی کـردەی سـواڵکردن و پـارانەوە لە کەسـانی دیـکە)[5]. تـاوانەکەش بە کردەیەکـی مـادی نەبێـت دەرناکەوێت، یاسادانەری میسر کردەوەی سـواڵکردنی دیـاری کـرد، جـا

ش. س. م.

١- المادة ٤/١٩ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل.

٢- د. فخري عبد الرزاق الحديثي شرح قـانون العقوبـات القسـم العـام مصـدر. سـابق ص١٧٨

٣- المادة ١/٣٩٠ من قانون العقوبات العراقي والمادة الأولى مـن قـانون التسـول فـي مصر رقم ٤٩ لسنة ١٩٣٣

٤- لمادة ١/٣٨٩/ب من قانون العقوبات الأردني رقم ١٦ لسنة ١٩٦٠ المعدل

٥- قرار محكمة النقض المصرية رقم ٧٤٤ في ١٩٧٢/١٠/٨ والمنشور في الموقع www.cc.gov.eg تمت المعاينة ٢٠١٦/١٢/٣٠

ئاشـكرا بووبێـت یـان شـاراوە، سزایشـی لەسـەر دا[1]، ئەمەش لەلایەن دادگـای نەقضـی میسـرەوە پشتڕاسـتكرایەوە كە دەڵێـت: (ئەوە ڕێگـری ناكات لەوەی مـرۆڤ بە سـواڵكەر هەژمـار بكرێـت، تـا ئەو كـارانەی كە بـانگەوازی بـۆ دەكـات بـۆ بەدەسـتهێنانی هاوسـۆزی خەڵـك، لەكاتێكـدا ئامـانجی سـەرەكی تۆمەتبـار سـواڵكردن بێـت)[2]. یاسـادانەری میسـر لەم بوارەدا سەركەوتوو بوو، بەو پێیەی كردەی سواڵكردنی دیـاری دەكـرد، جـا دیـار بـوو یـان شـاراوە، لەژێـر هەر پەردەیەكـدا، وەك فرۆشـتنی كلینـكس، پێشكەشـكردنی یـارییە سەركێشـیەكان، یـان شـتی دیـكە، بە پێچەوانەی یاسـادانەری عێراق و یاسـادانەری ئوردن، كە ئامـاژەیان بە دۆخـی سـواڵكردنی شـاراوە نەدەكـرد، وەك وەسـتان لەسـەر ڕێگـا گشتییەكان و لەبەردەم ترافیك لایتەكان و فرۆشتنی شتی هەرزان وەك بنێشت، یان سڕینەوەی جامی ئۆتۆمبێل سواڵكەرەكە هەمـوو ئەو كـارانە دەكات، بەبێ ئەوەی ڕایبگەیەنێ، كە داوای سـواڵ دەكـات، وا گونجـاوتر بوو بۆ یاسادانەری عێراقی سواڵكردنی شاراوە بە تاوان بزانێ و سزای بـدات، بـۆیە داوا لە یاسـادانەر دەكەیـن سـواڵكردنی شـاراوە بە تـاوان بزانێت، بەهۆی تەشەنەسەندنی دیاردەی سواڵكردنی شاراوە، بە ڕوونی لەبەردەم گـۆڕەپـان و دوكـانە گشـتیەكان بە بیـانووی فرۆشـتنی ئەو شتانەی كە هیچ بەهایەكیان نییە. لەمەدا هاوشـێوەی یاسـادانەری میسـر بێـت. لێـرەوە بۆمـان دەردەكەوێـت كە تـاوانی سـواڵكردن، تەنهـا بە پەسندكردنی لەلایەن سـواڵكەرەوە بەدەسـت دێـت، مەرج نییە سـواڵكەر پارەی وەرگرتبێ یان ئەوەی داوای كردووە بەدەستی هێنابێت، بۆیە بە دەسـتپێكردن بە سـواڵكردن یەكسـەر سـواڵكەرە دەچێـتە نـاو بـواری

ش. س. م.

---

١- المادة ١ من قانون التسول المصري رقم ٤٢ لسنة١٩٣٣

٢- قرار محكمة النقض المصرية رقم ٥٧٣ في ١٢/٣/١٩٣٤، والمنشور في الموقع www.cc.gov.eg تمت المعاينة ٣٠/١٢/٢٠١٦

تـاوانکردنەوە، چـونکە لە لایەک سـوالکردن بەخـۆی سـەرپێچی یاسـایە، لەلایەکـی دیکەشـەوە، لەبەر ئەوەی تـاوانێکی شـکلّییە، کە یاسـادانەر بە تەنهـا لەسـەر ڕەفتـارەکەی سـزای دەدات، بەبـێ ئەوەی پێویسـتی بە پشتڕاسـتکردنەوە دەرەنجـامی سـوالکەی هەبێـت، بـۆیە لە تـاوانی سـوالکردن دەسـتپێکردن دیـار نییـە و نـایەتەدی[1]، زۆربەی تاوانەکـانی سـوالکردن بە ڕەفتـار ئەنجـام دەدرێـن لەلایەن بکەرێکەوە، کە بەتەنهـا تـاوانەکە ئەنجـام دەدات و ئەمەش فـۆرمی ئاسـایی تـاوانی سـوالکردنە، چـونکە کـردەوەی سـوالکردن لەلایەن بکەرێکەوە ئەنجـام دەدرێت[2]، کە

ش. س. م.

١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە مادەی ٣٠ لە یاسای سزادانی عێراقی کە هەوڵدان بەم شێوەیە پێناسـەی دەکـات "دەستپێکردنی کردەوەیەک بە مەبەسـتی ئەنجامـدانی تاوانێک یـان کەتنێک، ئەگەر شـوێنەواری ئەو تـاوان و کەتنەیە بە هۆکارێک کە لەدەرەوەی ویستی تاوانبارەکە بێت، نەماو کۆتایی هات.

٢- لە ماددەی ٤٧ی یاسـای سزادانی عێراقی، تاوانبـار بەم شـێوەیە پێناسـە دەکـات: "بە تاوانبـاری تـاوانەکە دادەنرێـت ١- هەرکەسـێک بە تەنیـا ئەنجـامی بـدات یـان لەگەڵ کەسـانی دیکە ٢- هەرکەسـێک بەشـداری بکـات لە ئەنجامدانیـدا ئەگەر لە کۆمەڵێک کردەوە پێکبێت و بە ئەنقەست یەکێک لە کردەوەکانی ئەنجام بدات ئەو کـردەوانەی کە لە کـاتی ئەنجامدانیـدا پێکیـدەهێنن ٣- هەرکەسـێک پـاڵ بە هەر کەسـێکەوە بنێـت ئامرازەکـانی کەسـێک بـۆ ئەنجامـدانی ئەو کـردەوەیەی کە تاوانەکە پێکدەهێنێت ، ئەگەر ئەم کەسە بە هەر هۆکارێک بەرپرسیار نەبێت لە ڕووی تـاوانەوە. بـۆ زانیـاری زیـاتر، سـەیری: مـادەی ٣٩ی یاسـای سـزادانی میسری ژمارە ٥٨ی ساڵی ١٩٣٧ی هەموارکراو بکە، کە دەڵێت "ئەو بە تاوانبـاری تاوانەکە دادەنرێت."

یەکەم: هەرکەسێک بە تەنیا یان لەگەڵ کەسانی تر ئەنجامی بدات.

دووەم: هەرکەسـێک بچێتە نـاو ئەنجامـدانی تـاوانەکە، ئەگەر لە کۆمەڵێـک کـردەوە پێکهـاتبوو، ئەوا بەمەبەسـت یەکێک لەو کـردارانە ئەنجـام دەدات کە پێکهێنەری تاوانەکەیە" هەروەها بڕوانە: مادەی ٧٥ لە یاسای سزادانی ئوردنی ژمـارە ١٦ی سـاڵی ١٩٦٠، کە بـاس لەوە دەکـات "ئەنجامـدەری تـاوانەکە ئەو کەسـەیە کە ئەو

لەوانەیە تـاوانەکە لەڕێـگەی هاوبەشـێکەوە ئەنجـام بـدات و هاوبەشـی تاوانکـــاریش ئەوەیە کە زیـــاتر لە یەک کەس هاوکـــاری دەکـــات لە ئەنجامـدانی تاوانێک، بـۆ ئەوەی ئەم وێنەیە بەدەسـت بهێنرێت، دەبێت فرەیی تاوانباران و یەکێتی تاوانەکە هەبێت، واتە یەکێتی پایەی مـادی و مەعنەوی[1]. لە کاتێکدا یاسادانەری میسری بکەری تاوان و هاوبەشی لە سزاکەدا یەکسان کرد، لێرەوە هاوبەشی سزای بەو سزایەی کە بە یاسا بۆ تاوانەکە دیاری کراوە سزا دەدا، وەک یاسـادانەری میسـری مەرجی ئەوەی دابوو کە (هەرکەسێک بەشداری لە تاوانێکدا بکات، سزا دەدرێت، مەگەر یاســایەکی تــایبەت هەبێــت، هەڵاوێــردی بکــات)[2]. هەروەهــا یاسادانەری میسر جەختی لەسەر سزادانی هاوبەشی تاوان کردەوە و دەڵـێ: (ئەوەی تاوانێـک دەکـات، دەبێـت سـزا بـدرێت، تەنـانەت ئەگەر تـاوانێکیش بـوو بە مەبەسـتیش ئەنجـام نەدرابێـت، هەر کـات تـاوان کەوتەوە، یان کەسێک هانی بۆ تاوانکردن دا یان بەشداری تـاوانی کرد، پێویسـتە سـزا بـدرێت)[3]، بەهەمـان شـێوە یاسـادانەری ئـوردن سـزای هاوکارەکەی کردووە بە هەمان سزای تاوانباری ئەسڵی، بەو پێیەی کە (ئەگەر چەند کەسێک لە کۆمەڵدا تاوانێکی گەورە یـان تـاوانێکی بچـووک ئەنجـام بـدەن، یـان ئەگەر تـاوانەکە لە چەنـد وردە تاوانێـک پێکبێـت، هەریەکەیـان یەکێـک یـان زیـاتر لەو کردەوانەیـان ئەنجـام دابێـت، کە تاوانەکە پێکدەهێنن، ئەوا هەموویان بە هاوبەش دادەنران و هەریەکەیان بەو سزایە سـزا دەدرا کە لە یاسـا هـاتووە، هەر یەکەیـان وەک ئەوەی

---

توخمانەی کە پێکهێنەری تاوانەکە دەهێنێتە بوون یان ڕاستەوخۆ بەشداری لە جێبەجێکردنیدا کردووە.

١- د. علي حسين الخلف و د. سلطان الشاوي، مصدر سابق ص١٧٩,١٨٠

٢- المادة ٤١ من قانون العقوبات المصري. رقم ٥٨ لسنة ١٩٣٧

٣- المادة ٤٣ من قانون العقوبات المصري رقم ٥٨ لسنة ١٩٣٧

تاوانبارێکی سەربەخۆ بن، سزا دەدرێن)[1]. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە یاسـادانەری عێراقـی لە سـزادانی هاوبەشـانی تـاوان، وەک یاسادانەرانی میسر و ئوردن کردووە و لەوەشدا سەرکەوتوو بووە، وەک چۆن هاوبەشەکەی بەو سزایەی کە دیاری کراوە سزاداوە بۆ ئەو تـاوانەی کە بەشـداری تێدا کـردووە، وەک سـزای تاوانبـاری ئەسـڵی، مەرجی ئەوە هەیە کە (هەر کەسێک وەک تاوانبار یان وەک هاوبەش لە ئەنجامدانی تاوانێکدا بەشداری بکات، سزا دەدرێت بەو سزایەی کە بۆی دیاری کراوە، مەگەر یاسا بە پێچەوانەوە دیاری کردبێت)[2]. بەڵام یەکێک لەو مەترسیدارترین حاڵەتەکان دەبینین، کە لە ئێستادا هەیە، ئەویش ئەو بکەرە مەعنەوییە، کە کەسانی دیکە بەکاردەهێنێت بۆ ئەنجامدانی تـاوانی سواڵکردن، وەک چۆن دەبینین منداڵان ئامادەن لە هەموو ڕێگاوبـان و شوێنە گشتیەکاندا، لە شوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی تر دەجوڵێن، دڵنیایە کە کەسـانێک هەن کە بەکاریـان دێـنن و ناچاریـان دەکەن سـواڵ بـکەن، چـونکە مەحـاڵە گەنجانێـک کە لە هـیچ شـتێک تێنـاگەن بتـوانن لە گۆڕەپـانەکەدا ئامـادەبن، بەبـێ ئەوەی کەسـێک هەبێـت کە ئاڕاسـتەیان بکـات و کەرەسـتەی بەکارهێنراویـان سـواڵی شـاراوەیان بـۆ بکڕێـت. بکەری مەعنەوی بریتییە لە (هەر کەسێک کە کەسـانی دیکە بەردەست بکـات بـۆ ئەنجامـدانی تاوانێـک، سـوود لە خـاڵێکی لاوازی ئەو کەسـە وەربگرێت، یـان بەهۆی بچووکی تەمەنییەوە یان شێتبوونییەوە دەرک بە تاوانەکە نەکات)[3]. هەروەهـا پێناسـە کرا بە (ئەو کەسـەیە، کە پـاڵ بە کەسـانی تـرەوە دەنێـت بـۆ ئەنجامـدانی ئەو کـردەوەیەی کە تـاوانەکە پێکـدەهێنێت، ئەگەر ئەم کەسـە لە ڕووی سـزاوە، بە هەر هۆکارێـک

ش. س. م.

١- المادة ٧٦ من قانون العقوبات الأردني رقم ١٦ لسنة ١٩٦٠ المعدل.

٢- المادة ٥٠/١ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل.

٣- د. علي حسين خلف  ود سلطان الشاوي، مصدر السابق ص ١٩٥.

بەرپرسیار نەبێت)[1]. لەبەر ئەوەی پایە ماددییەکەی تاوانەکە ئەنجام نەدراوە، بەڵکو هاتووە خەڵکی دیکەی بەردەست کردووە، بۆ ئەنجامدانی تاوانەکە.

یاسادانەری عێراقی ئەکتەری بکەری مەعنەوی، بە بکەری تاوانەکە دەزانێت و ئەمەش ئەوەیە لە یاسای سزاداندا هاتووە، کە دەڵێت: (ئەو کەسە بە تاوانباری دادەنرێت ئەگەر پاڵ بە کەسێکەوە بنێت، بە هەر شێوەیەک بێت، بۆ ئەنجامدانی کردەوەی تاوانەکە، هەتاکو ئەگەر ئەو کەسە بە هەر هۆکارێک بەرپرسیاریش نەبێت لە ڕووی سزادانەوە)[2]، بکەری مەعنەوی لە بکەری ئەسڵی جیاوازە، چونکە بکەری مەعنەوی لە ڕێگەی کەسێکی ترەوە پەیوەستە بە تاوانەکەوە، کە بەرپرسیار نییە لە ڕووی تاوانەوە، لە کاتێکدا تاوانبارەکە ئەو. کەسەیە، کە پایە ماددییەکەی تاوانەکە ئەنجام دەدات[3]. هەروەها جیاوازە لە هاندان، چونکە ئەمەی دوایی لە چوارچێوەی دیزاینی تاوانکاری کەسێکی دیکەدایە، هەروەها بۆمان دەردەکەوێت کە مەرجی هاندان بۆ ئەو کەسانەیە کە دەتوانن درک بە سیفەتی تاوانکاری چالاکییەکەیان بکەن، ئەمەش بۆ ئەو کەسانە بەردەست نییە، کە لە ڕووی تاوانەوە بەرپرسیار نین، یان نیازپاکییان هەیە[4]. سەبارەت بە یاسادانەری عێراقیش بۆمان دەردەکەوێت کە بە توندی سزای ئەو کەسانە دەدا، کە هانی کەسێک دەکەن بۆ سواڵکردن، یاساکە نەوجەوانی هاوتا کرد

ش. س. م.

١- عبد الستار البزركان، مصدر سابق ص٢٩٤-٢٩٥

٢- المادة ٤٧/٣ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

٣- عبد الستار البزركان، المصدر السابق ص ٢٩٥.

٤- د نظام توفيق المجالي مصدر سابق ص٢٩٣.

لەگەڵ کەسی هاندەر و گەورەکانی، سزاکەش بوو بە زیندانکردن بۆ ماوەی کەمتر نەبێت لە ٣ ساڵ[1].

بۆیە بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەری عێراق سەرکەوتوو بووە لە توندکردنەوەی سزاکەدا، چونکە ئەو کەسە چیتر جێی متمانە نییە و سەرپەرشتیکردنی منداڵەکەی پشتگوێ خستووە، هەروەها ئەو توندییە بۆ پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ و زەلیل نەکردنییەتی، لە کاتێکدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو ئامرازانەی ئەنجامیان داوە لەلایەن تاوانبارەوە فرەن، چونکە هەر تاوانبارێک ئامرازی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئەنجامدانی تاوانەکە، بۆیە ئامرازەکان جیاوازن لە تاوانبار بۆ تاوانێکی دیکە[2]، بۆیە لەوانەیە ئەو جوولە ئۆرگانییەی کە سواڵکەر بەرجەستەی دەکات، بریتیبێ لە نووسین یان وێنەگرتن، یان ڕۆیشتن بێت ، یان سەر لەقاندن بێت، کە دەبێتە هۆی بەدیهێنانی تاوانی سواڵکردن، وەک چۆن پایە ماددییەکە بە کردەوەی ئەرێنی بەدەست دێت[3]، بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەر پێویستی بە ئامرازێکی دیاریکراو نەبووە بۆ گەیشتن بە سواڵکردن، بۆیە سواڵکردن تەنها بە ئەنجامدانی ڕەفتارەکە بەدەست دێت، جا چ بە ئاماژە، قسەکردن، یان هەر ڕەفتارێک کە ئاماژە بێت بۆ سواڵکردن. سەبارەت بە کاتی ئەنجامدانی ڕەفتارە تاوانکارییەکە، یاسادانەر کاتی ئەنجامدانی ڕەفتارە تاوانکارییەکە لەبەرچاو ناگرێت، جا شەو بووبێت یان ڕۆژ. وەک یاسایەکی گشتی، مەرجی ئەوەی دانابوو

ش. س. م.

١- المادة ٣٩٢ المعدلة بموجب قرار مجلس قياد الثورة المنحل رقم ١٦ لسنة ١٩٩٩ المنشور بالوقائع العراقية رقم ٣٧٧٨ في ١٤/٦/١٩٩٦

٢- د. فخري عبد الرزاق الحديثي، شرح قانون العقوبات / القسم الخاص مطبعة الزمان، بغداد، ١٩٩٦ ص ١٤٦.

٣- د. محروس نصار الهيتي، النتيجة الجرمية في قانون العقوبات مصدر سابق ص٦٤

که ڕەفتاری تاوانکاری لە شوێنێکی دیاریکراودا ڕوویدات، بەو پێیەی شوێنی کردەوەکە بە یەکێک لە توخمە پێکهێنەرەکانی تاوانەکە دادەنرێت[1]، وەک چۆن لە تاوانی سواڵکردندا، یاسادانەر مەرجی ئەوەی دابوو کە ڕوویدات لە ڕێگا گشتیەکان یان شوێنە گشتیەکان یان بەبێ مۆڵەت چوونە ژوورەوە بۆ ماڵێک یان شوێنێکی لکێنراو بەو ماڵە[2].
بەپێی ئەم بڕگانەی خوارەوەیە باسی ئەو شوێنانە دەکەین:

## یەکەم: سواڵکردن لەسەر ڕێگای گشتی

مەبەست لە ڕێگای گشتی چییە: ( بریتیە لە هەموو ڕێگایەک، کە بۆ خەڵک هەیە پێیدا تێپەڕێت لە هەموو کاتێکدا، جا لە چوارچێوەی خاوەنداریتی حکومەت بێت یان تاکەکان)[3]. شەقامە گشتیەکان ناوەندەکانی یەکە ئیدارییەکان بە یەکەوە دەبەستنەوە و ئەوانیش ئەو ڕێڕەوانەن کە شارەکان بە یەکترەوە گرێ دەدەن[4]. ئەو سواڵکەرەی کە لەم ناوچانەدا دەگەڕێن، داوای خێر دەگەن، بڕگەکانی ئەم یاسایەیان بەسەردا دەسەپێ، ئەو کەسەی لەسەر ئەو جادانە یان ڕێڕەوەکاندا بێت یان لە هەر یەکێک لە یەکەکانی ڕێگای لاوەکیەکاندا بێت، بە سواڵکەر دادەنرێت، بۆیە ڕێگای گشتی بە سروشتی خۆی بە شوێنی گشتی دادەنرێت[5].

---
ش. س. م.

١- د. محمد علي سالم شرح قانون العقوبات القسم العام مصدر سابق ص.١٣٩
٢- المادة ٣٩٠/١ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل
٣- د احمد امين، شرح قانون العقوبات الأهلي ط٣ المجلد الثالث, الدار العربية للموسوعات, بيروت, ١٩٨٢, قانون العراق العام العراقي.ص ٩٠٣.
٤- د. ماهر عبد شويش، شرح قانون العقوبات القسم الخاص المكتبة القانونية بغداد, ص٢٨٥.
٥- د. فخري عبد الرزاق، الحديثي شرح قانون العقوبات القسم الخاص مطبعة الزمان ١٩٩٦ ص ٢٥٦.

سەبارەت بە یاسادانەری عێراقیش سیستەمێکی شوێنیی دانا بۆ گەیشتن بە تاوانی سوالکردن، بە پێچەوانەوە، ئەگەر شوێن نەبوو، تاوانەکە ڕوونادات، هەروەها دەبێت تاوانەکە لەسەر ڕێگای گشتی ڕووبدات، دەبینین کە یاسادانەر لەمیانەی قسەکردنی لەسەر دیاردەی سوال بە شێوەیەکی ڕەها وشەی ڕێگای گشتی بەکارهێناوە، [1]. بەپێچەوانەی تاوانەکانی دیکە ڕێگای گشتی دیاری کرد، کە لەدەرەوەی شار و شارۆچکەکانە و بەهیچ شێوەیەک نەیکردە ڕەها[2]، بۆیە بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەر سزای سوالکەر دەدات لەسەر سوالکردنی لە هەموو ڕێگا گشتییەکان کە بۆ خەڵک لەبەردەستیدایە، جا لە ناو شارەکان بن یان دەرەوەی شارەکان، هەروەها دەبینین باشتر بوو کە یاسادانەر سزای سوالکردن بدات لە هەر شوێنێک بێت، لەبری ئەوەی دیاری بکات لە چ شوێنێک سزای دەدتات، بۆیە باشتر بوو ئەگەر هەموو ئەو حاڵەتانەی سوالکردن بگرێتەوە کە دەکەونە دەرەوەی ئەو شوێنانەی لە ماددەی ٣٩٠/١ی یاسای سزادانی عێراقیدا ئاماژەیان پێکراوە. هەروەها یاسادانەر مەرجی بۆ سزادانی سوالکەر داناوە، کە لەو شوێنانە بەمەبەستی سوالکردن ئامادەبێت و بەو پێیەش نەمانبینیوە، کە سوالکەر لەسەر دیاردەی سوالکردنی شاراوە سزادرابێت، کەچی دەبینین لە هەموو ڕێگا گشتییەکاندا بەربڵاوە، باشترە ئەگەر یاسادانەر ئاماژەی پێ بدات.

یاسادانەری عێراقی پێناسەیەکی بۆ شوێنە گشتییەکان نەکردووە، باسی دەستەواژەی شوێنە گشتیەکانی کردووە کاتێک باسی تاوانی

ش. س. م.

١- المادة ٣٩٠/١ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنه ١٩٦٩ المعدل.

٢- المادة ٤٤١ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنه ١٩٦٩ المعدل، کە دەڵێ: (سزای هەتاهەتایی یان زیندانی دەگرێت، ئەگەر یەکێک لەسەر ڕێگای گشتی دەرەوەی شار و شارۆچکەکان دزی بکات).

سوالکردندا کردووە، هەروەها باسی دەستەواژەی ڕێگایگشتی کردووە، کاتێک لە بڕگەکانی یاساکەدا سزاکانی دیاریکردووە: (هەر کەسێک لەسەر ڕێگاکە گشتیەکان سوالّ بکات ، بە زیندانیکردن بۆ ماوەی مانگێک کەمتر نەبێت و لە سێ مانگ زیاتر نەبێت سزا دەدرێت)[1]. شوێنە گشتیەکان، دوکانە گشتیەکان، یان چوونە ژوورەوە بەبێ مۆڵەت بۆ خانوویەک یان فرۆشگایەکی پەیوەست بەوەوە بۆ مەبەستی سوالکردن."٤، بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەری عێراق پانتاییەکی زۆرتر بە نموونەی شوێنەکان داوە، بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی سوالکردن بە هەموو جۆرەکانییەوە لە هەر کوێیەکدابێ، چونکە یاسادانەر ویستویەتی پارێزگاری لە سەلیقەی گشتی بکات، بە سزادانی هەر کەسێک کە دیمەنێک دروست بکات، بەهۆیەوە ڕەنگە هەستی خەڵک ئازار بدات، وەک چۆن سوالکردن بە گشتی دەبێتە هۆی هەراسانکردنی خەڵک، بۆیە تەنها کردەی سوالکردن لەو شوێنانە دەبێتە هۆی ئازاردانی هەستی هاولاتیان، بۆیە یاسادانەر مەبەستیەتی لەکەی وەسفی تاوان بە کردەی سوالکردنەوە بنێ، هەروەها کردەی سوالّ، مەترسی کەوتنەوەی تاوانی لە داهاتوو لێ پەیدا دەبێت، بەهۆی ئەوەی تاوانی سوالکردن، لە تاوانی حالّەتی ترسناکە[2].

هەروەها مزگەوتەکانیش شوێنی گشتین بەپێی ئەوانەی سەرەوە، هەربۆیە پێویستە بەرەنگاری سوالکەرەکان لەبەردەم مەزارگە ئاینیەکان ببینەوە، وەک بۆمان دەردەکەوێت، کە لە ڕۆژانی پێنجشەممە و هەینی سەردانیکەرێکی زۆر ئامادە دەبن ئەمەش ژمارەیەکی زۆر سوالکەر بۆ خۆی کێش دەکات و سەلیقەی گشتی تێکدەدەن، کە پێویستە پارێزگاری لەو سەلیقە گشتییە بکرێت، چونکە سەردانکەری زۆر ولاتی

ش. س. م.

١- المادة ٣٩٠/١ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنه ١٩٦٩ المعدل.

٢- د. محروس نصار الهيتي، مصدر سابق ص١٥٧.

جیاوازی جیهان، بۆ هاتنە سەر ئەو مەزارانە سەردانی عێراق دەکەن، ئەمەش هەستیان بریندار دەکات و ئازاری ویژدانیان دەدات.

دووەم: سوالّکردن بە چوونە ناو مالّان یان شوێنێکی لکێنراو بەو مالّەوە بەبێ مۆلّەت.

مالّ بریتییە لە (هەر شوێنێک، کە مرۆڤ تێیدا هەست بکات لە چاوی کەسانی دیکەدا پارێزراوە)[1]، هەروەها کەسانی دیکە بەم شێوەیە پێناسەیان کردووە :(ئەو شوێنەیە، کە لە ڕاستیدا بۆ نیشتەجێبوون دیاری کراوە، تەنانەت ئەگەر لە بنەڕەتدا شوێنی نیشتەجێبوون نەبووبێت، وەک دەکرێت ئەسپەوانێک لە تەویلە بخەوێت و شوانێکیش لە هۆل)[2]، مەرج نییە خانووەکە تەلار بێت، بەلّکو بە خانوو دادەنرێت تەنانەت ئەگەر لە دار یان چادری (ڕەشمالّ)یش دروستکرابێت[3]، خانو بۆی هەیە بگوازرێتەوە یان جێگیر بێت، خانووە دەبێت کەسەکە کاتەکانی پشوودان یان خەوتنی تێدا بەسەر دەبات، خانووی پیشەسازی و بانک و دوکانی دارتاشی بە خانوو دانانرێت، مەگەر کەسێک تێیدا بخەوێت[4]، لە خانوودا هیچ ڕەچاوی جۆر یان کوالیتی شوێنەکە ناکرێت، بۆیە ئەگەر خانووەکە بۆ کار بەکاربهێنرێت، گرنگی خۆی وەک مالّێک لەدەست نادات، بەلّکو گرنگی خۆی وەک مالّ لەدەست دەدات، ئەگەر بە پێشێلکردنی یاسا بەکاربهێنرێت، ئەوەی بکرێتە شوێنی بازرگانیکردن بە ماددە هۆشبەرەکان و قومارخانە، هەروەها کوالیتی شوێنەکە گرنگ نییە، وەک چۆن ژووری ناو هۆتێلەکە

ش. س. م. ――――――

١- سەیری: مادە ٤٢٨ من قانون العقوبات العراقي، رقم ١١١، لسنة ١٩٦٩.

٢- محمد ابراهیم فلاحي، المكان كظرف مشدد لجريمة السرقة، في قانون العقوبات العراقي والقضاء، مكتبة صباح، بغداد، ٢٠٢١، ص٥٣.

٣- د . احمد امين شرح قانون العقوبات الأهلي مصدر سابق ص٩٠٦

٤- د. احمد أمين شرح قانون العقوبات الأهلي, المصدر السابق, ص ٩٠٦ ٥

ئەگەر سەلمێندرا، کە کەسەکە بۆ ماوەیەک تێیدا نیشتەجێیە، وەک خانوویەک وایە، دادگای نەقضی میسری ماڵی وا پێناسە کردووە: ( هەر شوێنێک مرۆڤ بیکاتە گوشەیەک بۆخۆی جارجارە یان به هەمیشەیی لێ بمێنێتەوە، ئەوا ئەو شوێنە حەرەمی پارێزراوی ئەوە، بۆ کەس نییە، بەبێ مۆڵەتی ئەو بچێتە ژوورەوە)[1]. کەواتە ماڵ ئەو شوێنەیە کە بۆ هیچ کەس نییە بەبێ مۆڵەتی بچێتە ناویەوە، جگە لە خاوەنی شوێنەکە نەبێت، یاسادانەریش مەرجی ئەوەی خستۆتەڕوو کە چوونە ژوورەوەکە بەبێ مۆڵەتی قوربانییەکە نایاسایی بێت، بەو پێیەی چوونە ژوورەوە بە نایاسایی دادەنرێت، تەنانەت ئەگەرچی خاوەنی شوێنەکەش نارەزایەتی دەرنەبڕی بێت، بزانێت نیازی خراپەشی نییە، هەر بۆی نییە بەبێ ئیزن بچێتە ژوورەوە[2]، بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەر ئامرازی چوونە ژوورەوەی دیاری نەکردووە، مەگەر بەبێ مۆڵەت نەبێت و تاوانبار کلیلی ساختە بەکاربهێنێت یان دەرگاکە بشکێنێت. ئێمە ئەمە بە گرنگ نازانین بەپێی بڕگەکانی ماددەی ١/٣٩٠ کە تێیدا هاتووە: چوونە ژوورەوە بۆ ماڵ یان پاشکۆی ماڵەکە، بە مەبەستی سواڵکردن بێت بەبێ مۆڵەت، ڕێگەپێدراو نییە، یاسادانەر بۆیە ئەو مافەی داوەتە خاوەن ماڵ، تاکو تایبەتمەندێتی تاکەکان بپارێزێ و هەموو کەسەکانی ژیانی نهێنی خۆی بەسەر بەرێت و ڕێزگرتن لە تایبەتمەندیەکەی بگیرێت، کە یەکێکە لە گرنگترین ئەو مافانەیە، کە بە مرۆڤ دەبەخشرێت[3]، دەبینین یاسادانەر مەرجی داناوە بۆ سواڵکردن، ئەویش بە چوونە ژوورەوە بۆ

ش. س. م.

١- قرار محكمه النقض المصرية رقم ١٧٣٢ في ٦/١/١٩٦٩ والمنشور في الموقع www.cc.gov.eg.

٢- د. فخري عبد الرزاق الحديثي شرح قانون العقوبات الخاص مصدر سابق ص٢٣٥.

٣- د احمد فتحي سرور ، مصدر سابق ص ٣٥.

ماڵەکە بە هەر شێوەیەک بێت ئەنجام بدرێت، بۆیە یاسادانەر شێوازی چوونە ژوورەوەی ڕوون نەکردەوە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە چوونە ژوورەوەکە، بەبێ مۆڵەت لە خاوەن ماڵەکە ڕوویدات، کەواتە کەی هاتنە ژوورەوە بۆ ماڵەکە ڕوویدا، بە مەبەستی سواڵکردن ڕوویدا، تاوانی سواڵکردن بەدی دێت، چونکە سەرپێچیکردنی حەرەمی ماڵ بە گوێرەی حوکمەکانی مادەی ٤٢٨ ی یاسای سزدانی عێراقی بە زەوتکردنی ئەو ئارامییە دادەنرێت، کە هاوڵاتی دەبێت لە ماڵەکەیدا چێژی لێ وەربگرێت. هەرچی پاشکۆی ماڵەکەیە، ئەوە هەموو شتێکە کە بە دەوری ماڵەکەدا دەڕوات، وەک باخچە و هۆڵ و کۆگا، پێویستە لەناو حەوشەی دیواری ماڵەکەدا بێت، ئەگینا بە جیا لێی دادەنرێت و بە حەرەمی ماڵەکە وەرناگرێت[1]. ئەوانی تریش پێناسە پاشکۆیان وا کردووە: (ئەو جێگایانەیە، کە پەیوەندییان بە شوێنی نیشتەجێبووەوە هەیە، بۆ سوودێک دیاریکراون، کە ڕاستەوخۆ یان بە بەستنەوەی لەگەڵیدا بە یەک دیوارەوە بەستراوەتەوە، وەک بەشێکی دانەبڕاو لێی دەردەکەوێت)[2]، لە یاساکە جیاوازی لە نێوان بیانیەک و هاوڵاتیەکی ئاسایی نەکردووە، بەو پێیەی هەموو کەسێک چێژ لە حەرەمی نیشتەجێبوونی خۆی وەردەگرێت.

سەبارەت بە یاسادانەری عێراقیش مەرجی ئەوەی دانا، کە کردەی سواڵکردن بە چوونە ناو ماڵ یان پاشکۆکەی بەبێ مۆڵەت بە مەبەستی گەیشتن بە تاوانی سواڵکردن ڕوودەدات[3]، بۆمان دەردەکەوێت کە چوونە ژوورەوەی ماڵان بەبێ ئیزن، حورمەتی ماڵەکە پێشێل دەکات و

ش. س. م.

١- د. احمد أمين شرح قانون العقوبات الاهلي، مصدر سابق ص٨٠٧

٢- د. رؤوف عبيد جرائم الاعتداء على الأشخاص والأموال، دار النهضة العربية ١٩٧٦، ص ٣٧٧

٣- المادة ٣٩٠/١ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل.

تاوانێکی دیکە دێنێتە ئاراوە، لە رووی سزادانیشەوە، سزاکەی توندتر دەبێت، لە سوالکردنەکە[1]. لێرەوە ئەگەر یاسادانەر ئەم بابەتە بخاتە بەردەم ئەو کەسانەی کە بە بیانووی سوالکردنەوە دەچنە ناو مالانەوە، ئەوا هەموو کەسێک بۆ دزی چووەنە مالان، ئەگەر ئاشکرانەبێت، دزە، ئەگەریش نا سوالکەرە، بەم شێوەیەش ئەمە دەبێتە بیانوو بۆ ئەوانەی دەیانەوێت دزی بکەن[2] یان حورمەتی مال پێشێل بکەن[3]، کە دەچنە شوێنی نیشتەجێبوونێک و ئیدیعای ئەوە دەکات، کە بە مەبەستی سوالکردن نەوەک دزیکردن چووەتە ژوورەوە. لێرەوە داوا لە یاسادانەری عێراقی دەکەین، وشەی (مال/ المنزل) لابەرێت و وشەی (شوێن) بەگشتی بخاتە جێگای، واتا تاوانی سوالکردن لە هەموو شوێنی روودەدات.

ش. س. م.

١- د. احمد فتحي سرور الحق العام في الحياة الخاصة مجلة القانون والاقتصاد، العدد ٤٥ ١٩٨٧ ص ٣٥

٢- المادة ٤٢٨/١/١ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل، كە تێیدا هاتووە و دەڵێ: سزای زیندانیکردن بۆ ماوەی ساڵێک زیاتر نەبێت و غەرامەکردن لە سەد دینار زیاتر نەبێت، یان بە یەکێک لەم دوو سزایانە سزا دەرێت: أ/ هەرکەسێک بەبێ ڕەزامەندی بچێتە ناو شوێنێکی نیشتەجێبوون یان یەکێک پاشکۆکانی بەبێ مۆڵەتی خاوەن مال زانیاری زیاتر سەیری: قانون تعديل الغرامات العراقي ص ١٨

٣- المادة ٤٤٠/٤ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنه ١٩٦٩ المعدل، كە دەڵێ: هەرکەسێک دزییەک ئەنجام بدات، کە ئەم بارودۆخانە تێیدا تێکەڵ بکرێن، سزای زیندانی هەتاهەتایی یان کاتی دەدرێت: دزییەکە لە شوێنێکی نیشتەجێبوون، یان لە یەکێک پاشکۆکانیدا ئەنجامدرابێت و چوونە ژوورەوەکە بەسەر بە سیاجی دیوارێک، یان شکاندنی دەرگایەک ، یان هاوشێوەکانی، یان بەکارهێنانی کلیلی ساختە، یان خۆدزینەوە لە کەسێکی گشتی، یان بەناوی ئەنجامدانی خزمەتگوزارییەکی گشتی یان بە هاوکاری لەگەڵ یەکێک لە دانیشتوانی شوێنەکە یان بەکارهێنانی هەر فێڵێک

## لقی دووەم
## دەرئەنجامی تاوانکاریی

ئەنجامی تاوانکاریی بە توخمی دووەمی پایەی ماددی تاوان دادەنرێت، ئەم ئەنجامە بە ڕەفتاری تاوانکاری کاریگەر دەبێت، کە مەبەستی یاساکە لە سزا ئەو رەفتارەیە[1]. یان ئەو (ڕەفتاری تاوانکاری و دەستدرێژییە لەسەر بەرژەوەندی گشتی کە بەهۆی یاساوە پارێزراوە)[2]. چونکە هیچ ڕەفتارێکی تاوانکاریی نییە کە ئەنجامەکەی بگۆڕێت، ئەنجام ڕاستییەکی یاساییە کە بە ڕەفتاری تاوانکارییەوە لکاوە، کە خۆی لە دەستدانی ئەو بەرژەوەندییە دەبینێتەوە، کە یاسا پاراستوویەتی[3].

دەرئەنجامی تاوانکاریی بەسەر دوو چەمکدا دابەش دەبێت، یەکەمیان چەمکی یاساییە، کە بیرۆکەیەکی یاساییە، بەو پێیەی لەسەر بنەمای زیانی مەعنەوی دامەزراوە کە تووشی بەرژەوەندییەک یان مافێک دەبێت، کە بە یاسا پارێزراوە، بەپێی ئەم بیرۆکەیە، تاوانەکە ڕوودەدات ، تەنانەت ئەگەر لە ئەنجامی ڕەفتاری تاوانکاری و زیانی ماددیش نەبێت، چونکە بەپێی ڕێڕەوی ئاسایی زیانەکە لە داهاتوودا ڕوودەدات، بە ناچاری ئەمە تاوانی سواڵکردنیش دەگرێتەوە، چونکە بە تەنها ڕەفتاری ڕووت بەسە، بۆ ئەوەی لێپرسینەوە لە کەسێکی

ش. س. م.

١- د أكرم نشأت ابراهيم القواعد العامة في قانون العقوبات المقارن ط١ مطبعة الفتيان, بغداد, ١٩٩٨,ص ١٧٠.

٢- د عبد العظيم مرسي وزير، شرح قانون العقوبات القسم العام ٣٦،١ دار النهضة العربية ٢٠٠٩, ص ٢٧٥.

٣- د. عبد العظيم مرسي وزير، مصدر سابق ص٢٧٥

سـوالّكەر بـكەی لەبـارەی تـاوانی سـوالّكردنەكە، تەنـانەت ئەگەر ئەو ئەنجامە تاوانكارییەش لە رەفتارە تاوانكارییەكەی پەیدا نەبووبێ[1]، بەو پێیەی ئەنجامی تاوانكاری بە هەستكردن بە مەترسی زیانێكی ئەگەری گریمـانە دەكـات، واتە هەرەشـەیەكە تەنهـا كـاریگەری لەسـەر ئەم بەرژەوەنـدییە پـارێزراوە هەیە، لە تاوانبـاركردنی مەترسـیدا یاسـادانەر پەنا دەباتە بەر پێوەرە بابەتییەكان، كە لە رەوتی ئاسـایی كاروبارەكاندا نـوێنەرایەتی دەكرێـت، واتە تـا چەنـد ئەم رێبـازە توانـای رەوانـدنەوەی مەترسی هەیە[2]. یاسادانەر لەسەر تەنها ئەنجامدانی رەفتاری تاوانكاری، بەبێ گوێدانە بەدەستهێنانی ئەنجامەكان، سزای رەفتـارەكە دەدات بەبـێ ئەوەی زیانێكی ماددی بەرجەستە هەبێت، بە تەنها بوونی مەترسییەكە بەسە بۆ ئەوەی یاسادانەر سزای رەفتـارەكە بدات، چونكە ئەو تاوانـانە بە تاوانی شكلّی وەسف دەكرێن[3]. تاوانی سوالّكردنیش یەكێكە لە تـاوانە شێوەییەكان (شكلیة)، كە یاسادانەر بۆ دانانی سزا پشـتی پێدەبەسـتێ و بەتەنها بە بوونی رەفتاری تاوانكاری و بەبێ بوونی ئەنجامی تاوانكاری یاسـا سـزای بۆ دیـاری دەكات، یاسـادانەر سـزای رەفتـار دەدات، بەبـێ ئەوەی سـەیری زیـانی مـادی بكـات، ئەمەش بەهـۆی گەیشـتن بە ئەنجامێـك، بە مانـای یاسـاییەكەی كە خۆی دەسـتدرێژیكردنە سـەر ئەو بەرژەوەندییەی كە یاسادانەر بەنیازە پارێزگاری دەبینێتەوە، كە ئەویش بەرژەوەندی كۆمەلّگایە[4].

ش. س. م.

١- د. سامي النصراوي، المبادئ العامة في قانون العقوبات مصدر سابق، ص ٢١٧

٢- د. محروس نصار الهيتي النتيجة. مصدر سابق ص٣١

٣- د. محمد علي السالم شرح قانون العقوبات القسم العام مصدر سابق ص١٤١.

٤- د. عبد الباسط محمد سيف الحكيمي النظرية العامة للجرائم ذات الخطر العام مصدر سابق ص١٤١

دووەمیان چەمکی ماددی ئەنجامەکەیە، کە خۆی لەو گۆڕانکاری و دەستکارییەی دەبینێتەوە، کە لە جیهانی دەرەوەدا وەک کاریگەری ڕەفتاری تاوانکاری ڕوودەدەن، هەر دەبێت پەیوەستییەکی مادی کە ئەنجامەکە بە بە ڕەفتارە تاوانکارییەکە گرێ بدات، لە تاوانی کوشتندا، ئەنجامەکەی پێویستی بە لێکۆڵینەوەی مادی بەرجەستە هەیە[1]. ئەم چەمکە لەسەر تاوتانی سواڵکردن جێبەجێ نابێت، چونکە تاوانی سواڵکردن لە تاوانە مەترسیدارەکانە، وەک پێشتر قسەمان لەبارەیەوە کرد.

## لقی سێیەم
## پەیوەندی هۆکاری

پایەی سێیەمی پایەی ماددی خۆی لە پەیوەندی نێوان کردەوەکە و ئەو ئەنجامە تاوانکارییە دەنوێنێ، کە ڕوویداوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە پەیوەندی هۆکاری بوونی هەیە، بە مەرجێک ئەو کردەوەیەی کە لە لایەن تاوانبارەوە دەرچووە هۆکارێک بێت بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامێک[2]. زۆربەی یاسا ناسەکان بە کۆی دەنگ لەسەر ئەوە کۆکن، کە پەیوەندی هۆکاریتی لە تاوانەکانی مەترسی داماڵدراو پێویست نییە، بە پێچەوانەی تاوانەکانی زیانگەیاندن، کە تێیدا پێویستە پەیوەندی هۆکاریتی نێوان ڕەفتار و ئەنجامەکە لەبەردەستدا بێت، چونکە تاوانە مەترسیدارەکان تەنها بە نواندنی ڕەفتارێک کە یاسا وەسفی کردووە، ئەنجام دەدرێت،

ش. س. م.

١- د. نظام توفيق المجالي، مصدر سابق ص٢١٥-٢١٦

٢- عبد الستار البزركان، مصدر سابق ص٥٨

بەبێ ئەوەی پێویستی بە زیانێکی پشتڕاستکراوە بکات[1]. یاسادانەری عێراق ئەمەی لە یاسای سزادان ڕوون کردووەتەوە[2]، لەوانەش سوالکردن تاوانێکی شکڵییە، کە پێویستی بە ئەنجامێکی ماددی نییە، وەک ئەوەی دەیکات پێویستی بە بوونی پەیوەندییەکی هۆکارانە نییە لە نێوان ڕەفتار و ئەنجامەکەدا، بۆیە کاتێک ڕەفتاری سوالکردن ئەنجام دەدرێت، هیچ بوارێک نییە بۆ گەڕان بەدوای پەیوەندی هۆکارێتی لەگەڵ ئەنجامەکە بە شێوەیەکی خۆکرد بەدەست بهێنرێت، تەنها بە کردنی کرداەکە، بەدیاردەکەوێت، ئەویش لە ڕێگەی داواکردن یان لالانەوە.

---
ش. س. م.

١- د. عبد الباسط محمد سيف الحكيمي النظرية العامة للجرائم ذات الخطر العام مصدر سابق، ص ١٠٣

٢- لە ماددەی ٢٩ لە یاسای سزادانی عێراقی، کە تێیدا هاتووە: (١- کەسێک بەرپرسیار نییە لە تاوانێک کە لە ئەنجامی هەڵسوکەوتی تاوانکارییەوە نەبوبێت، بەڵام بەرپرسیارە لە تاوانەکە تەنانەت ئەگەر لەگەڵ هەڵسوکەوتە تاوانکارییەکانیدا بەشداری کردبێت هۆکارێک بووبێ لە هۆکارەکانی یان پێشووتر هۆکار بووبێ، ٢- تەنانەت ئەگەر بێ ئاگا بووبێت لەوە، بوونی هۆکارەکە بە تەنیا بەسە بۆ هێنانەدی دەرئەنجامە تاوانکارییەکە، ئەوا تاوانبار لەم کەیسەدا تەنها بەرپرسیارە لەو کارەی کە ئەنجامی داوە).

# تەوەری دووەم
# پایەی مەعنەوی

هیچ تاوانێک بەبێ پایەی مەعنەوی بوونی نییە، بەو پێیەی ڕێگایەکە بۆ یاسادانەر بۆ دیاریکردنی بەرپرسیارێتی تاوانکاری و مەرجێکە بۆ گەیشتن بە دادپەروەری کۆمەڵایەتی، چونکە دادپەروەرانە نییە سزا بەسەر کەسێکدا بسەپێنرێت، کە هیچ پەیوەندییەکی دەروونیی لەگەڵ مادیەتی تاوانەکە نەبووە، چونکە پایەی مەعنەوی ڕووی ناوەوەی ڕەفتاری تاوانکارییە[1]، هەروەک چۆن پایە مادییەکە ڕووی دەرەوەی بەرجەستەی ڕەفتاری تاوانکارییەکەیە، بۆمان دەردەکەوێت کە پایەی مەعنەوی خۆی لە ڕۆحی بەرپرسیارێتی تاوانکاری دەنوێنێ، وەک چۆن ئاماژەیە بۆ مەیلی ئیرادە و ویست بۆ ئەوەی ڕەفتاری تاوانکاری ئەنجام بدات، یان مەیلی ئەنجامدانی رەفتارێکی هەبێت، کە سزای یاسایی لەسەرە[2]. بنەمای بەرپرسیارێتی بەئەنقەست لەسەر بنەمای مەبەستی تاوانکاریی دەوەستێ و بەرپرسیارێتی نائەنقەست لەسەر بنەمای هەڵە دەوەستێ[3]، تاوانی سواڵکردن هاوشێوەی تاوانە مەبەستدارەکانی دیکە لەسەر بنەمای مەبەستی تاوانکاریی دەوەستێ، کە فیقهـ بەم شێوەیە پێناسەی کردووە: (تاوانبار ئاگاداری توخمەکانی

ش. س. م.

١- د طلال ابو عفيفة شرح قانون العقوبات القسم العام, دار الثقافة للنشر والتوزيع, عمان, ٢٠١٢, الأردن ص ٣١١.

٢- د. محمد صبحي نجم شرح قانون العقوبات / القسم العام النظرية العامة للجريمة دار الثقافة للتوزيع والنشر, عمان, ٢٠٠٨, ص ٢٩٦.

٣- د.جمال إبراهيم الحيدري أحكام المسؤولية الجزائية ط ١ منشورات زين الحقوقية, بغداد ٢٠١٠, ص ١٥٠

تـاوانەکەیە و ویسـتی خۆشـی بە ئاراسـتەی بەدیهـاتنی ئەو توخمـانەی تاوانەکەیە یان پەسندییان دەکات)[1].

سەبارەت بە یاسادانەری عێراقیش، ئەو لە یاسـای سـزادانی ژمـارە ١١١ی سـاڵی ١٩٦٩دا مەبەسـتی تاوانکـاری بەمشـێوەیە پێناسـەکردوە: (ئاڕاسـتەکردنی ئیـرادەی تاوانبـار بـۆ ئەنجامـدانی ئەو کـردەوەیەی کە تــاوانەکە پێکــدەهێنێت، بە ئامـــانجی ئەو دەرەنجـــامێکی تاوانکـــاریی بەدیبێت)[2]. هەروەهـا بۆمـان دەردەکەوێت کە ئەو ئاشـکرای کـردووە و ڕایگەیاندووە، کە دەبێت نیەتی تاوانکاری لە تـاوانی سـواڵکردندا ئامـادە بێت، کاتێک مەرجی کردووە، کە سواڵکەر لەو شـوێنانەدا ئامادەبێت، کە یاسـادانەر دیـاریی کـردووە، بـۆ مەبەسـتی سـواڵکردن بێت[3]، یاسـادانەر سەرکەوتوو بووە لە دەربرین بە ئاشکرا مەبەستی تاوانکاری لە تـاوانی سـواڵکردندا دیـاریکردووە، چـونکە خەڵکێکـی زۆر لە جـادە و شـوێنە گشـتیەکاندا هەن، و مەبەسـتیان سـواڵکردن نـیـە، بەڵکـو فرۆشـتن یـان پراکتیزەکردنـی هەنـدێک کـارە بە ئامـانجی بەدەسـتهێنانی سـەرچاوەی بژێوی ژیـان ئەنجامی دەدەن، هەروەهـا چـونکە یاسـادانەر ویستویەتی جەخت لەسـەر ئەوە بکاتەوە کە تـاوانی سـواڵکردن لە تاوانەکـانی دیکە سـەرپێچی یاسـا جیاوازە، بۆیە هـاتووە جەخت لەسـەر پێویسـتبوون و بەردەسـتبوونی مەبەسـت لە تـاوانەکە دەکـاتەوە، ئینجـا دەیسـەلمێنێ کە ڕەفتارە تاوانکارییەی کە بە سواڵکردن ناسراوە، سەرپێچی یاسایە.

ئەو مەبەسـتەی کە لە دەبێت لە تـاوانی سـواڵکردندا بـوونی هەبێت مەبەسـتێکی گشـتیەیە، کە خـۆی لە زانـین و ئیـرادە بەرجەسـتە دەکـات، بەڵام ئێمە نامانەوێت ئەوەنـدەی ڕۆشـنایی بخەینە سـەر ئەو مەبەسـتە

ش. س. م.

١- د. محمود نجيب حسني, النظرية العامة للقصد الجنائي ، مصدر سابق، ص ٥٠ .

٢- المادة ٣٣ قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل.

٣- المادة ٣٩٠/١ قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل.

تاوانکارییەی، کە لە تاوانی سواڵکردن هەیە، بەڵکو زیاتر دەمانەوێت تیشک بخەینەسەر بەمەستی تاوان، کە بەهۆیەوە تاوانی سواڵکردنەکە بەدیهاتووە، زانین و ئاگاداربوون بە رەگەزەکانی تاوان، یەکێکە لە مەبەستەکانی تاوانبار، مەبەست لێی (ئەو حاڵەتە زیهنییەیە و دیاردەیەکی دەروونییە، کە پەیوەندی نێوان فەرمان و چالاکی زیهنی کەسەکە بەرجەستە دەکات)[1]. هەرچی ئیرادەیە گرنگییەکەی لە گرنگی زانین زیاترە. زانین لە خۆیدا پێویست نییە، بەڵکو وەک قۆناغێک لە دروستبوونی ئیرادە و مەرجێکی بنەرەتیە بۆ تێڕوانینی تاوانبار[2]، بە قۆناغی دووەم لە دوای زانین دێت، تاوانبارەکە هەموو زانین و زانیاری لای خۆی بۆ بونیادنانی بڕیاری ئەنجامدانی تاوانەکەی بەکاردێنێ)[3]، ئیرادە توخمێکی پێویستە لە هەموو شێوەکان پایەی مەعنەوی ئەخلاقیدا، جا چ شێوەی نیەت وەربگرێت یان شێوەی هەڵە وەربگرێت، بەو پێیەی جیاوازیی نێوان نیەت و هەڵە لەوەدایە، کە ئیرادە جەخت لەسەر چ دەکاتەوە، لە تاوانە مەبەستدارەکاندا ئیرادە تیشک دەخاتە سەر ئەو ڕەفتار و ئەنجامەی کە سزای لەسەرە، لە حاڵەتی هەڵەدا، ئیرادە بەرەو ڕەفتارەکە دەچێت، بەبێ ئەوەی ئەنجامی بووبێ[4]. مەبەستی تاوانکاری بیرۆکەیەکە کە جەوهەرەکەی ئەو ئیرادەیە کە مەیلی پێشێلکردنی یاسای هەیە[5]. بەو پێیەی تاوانی سواڵکردن یەکێکە لەو تاوانە مەبەستدارانەی کە ڕەفتاری ئەبستراکتیان هەیە، کاتێک ئەو ڕەفتارەی کە بە سواڵکردن و دەستپانکردنەوە بەرجەستە دەبێت،

ش. س. م.

١- د طلال ابو عفيفة، مصدر سابق، ص ٣١٦

٢- د نظام توفيق المجالي، مصدر، سابق ص٣٢٧

٣- د. عبود السراج, قانون العقوبات القسم العام، مصدر سابق ص٢٢٥

٤- د. عبد الباسط سيف الحكيمي, مصدر سابق ص١٥٠

٥- د. محمود نجيب حسني النظرية العامة للقصد الجنائي مصدر سابق ص٢٥

راستەوخۆ ئەنجامی تاوانکارییەکە بەدەست دێت. تاوانەکە پێشێلکردنی ئەو یاسایانەیە کە یاسادانەر دایانناوە، ئەم نافەرمانیەش ئاشکرا نابێت، مەگەر ئیرادەی گوناهکار بوونی نەبێت، واتە ئیرادەی تاوانبار بەرەو بەدیهێنانی ڕووداوەکە، ئیرادە لە دوو رەگەز پێکدێت: لێهاتوویی سزایی (الاهلیة الجزائیة) و گوناهی تاوانکار (الاثم الجنائي)[1]، ئەگەر لێهاتوویی نەبوو، کەواتە ئیرادەشی نییە، بەمەش مەبەستیش لە تاوان بوونی نابێت، ئەمەش بەسەر منالانی سوالکەردا جێبەجێ دەبێت، ئەوانەی لە گۆڕەپانەکاندا دەسوڕێنەوە لە ڕووی تاوانەوە بەرپرسیار نین. یان تەمەنیان کەمە یان بەهۆی کاری زۆرەملێ لەلایەن هەندێک باندەکانەوە ئەم منداڵانە دەقۆزرێنەوە، یان لەلایەن هەندێک کەسەوە کە پەیوەندیی خزمایەتی یان نزیکایەتییان هەیە بەکاردەهێنرێن، بەمەش ئەوان ئەنجامدەری تاوانەکەن نەوەک منالەکە. بەمە دەوترێت بکەری مەعنەوی[2].

ئیرادە لە کردنی کردارەکە نزیکترە و هێنانەدی ئەنجامەکەش جێی متمانەترە، بەو پێیەی ئاراستەی ئیرادە بۆ گەیشتن بە ئەنجامە نەک بە خودی کردارەکە، ئاراستەی ئیرادە بۆ کردارەکەش لە بابی درککردنەوەیە، بەوەی کە کارەکە دەبێتە هۆی ئەنجامی تاوانکاری[3]. دادگای نەقزی میسری جەخت لەمە دەکاتەوە و لە یەک لە حوکمەکانی ڕوونیکردۆتەوە، کە ئەوەی ڕێگری ناکات لەوەی کەسێک بە سوالکەر

ش. س. م.

١- د. جمال ابراهيم الحيدري، أحكام المسؤولية الجزائية، مصدر سابق ص٩٣

٢- ڕوانە مادەی ٢/٤٧ لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی هەموارکراوی ساڵی ١٩٦٩، کە دەڵێت "هەرکەسێک هانی کەسێک بدات، بە هەر شێوەیەک بێت، بۆ ئەنجامدانی ئەو کردەوەیەی کە تاوانەکە پێکدەهێنێت، بە ئەنجامدەری تاوانەکە دادەنرێت ئەگەر ئەم کەسە بەرپرسیاریش نەبێت".

٣- د. جمال ابراهيم الحيدري، احكام المسؤولية الجزائية، مصدر سابق، ص ٨٥

هەژمار بکرێت، بەهۆی ئەو کردارانەی کە ڕەنگە بانگەوازی بۆ بکات بۆ بەدەستهێنانی هاوسۆزی خەڵک، کاتێک سەلمێندرا کە ئامانجی سەرەکی تۆمەتبار، سواڵکردن و دەستپانکردنەوەیە[1]." بۆیە بۆمان دەردەکەوێت، ئەگەر ویستی تۆمەتبارەکە بە ئاراستەی سواڵکردن بێت و سەلمێندرا کە ئامانجی یەکەمی تۆمەتبار لەم کارەی سواڵکردنە، ئەوا لێرەدا مەرجەکانی یاسا لە سەپاندنی سزای دیاریکراودا بەسەریدا جێبەجێ دەکرێن، ئیرادە چالاکییەکی دەروونی بەرەو بەدیهێنانی ئامانجێکی دیاریکراو هەنگاو دەنێ، وەک ئامانجێکی نزیک کە بنەماکەی هاندان و پاڵنەرە، هەروەها ئامانجێکی دوور بۆ تێرکردنی پێویستییەکی دیاریکراوە، بۆ نموونە کەسێک کە هەست بە برسێتی دەکات، پێویستی بە جلوبەرگ دەبێت، ڕووبەڕووی پاڵنەرێکی دەروونی دەبێتەوە بۆ تێرکردنی ئەم پێویستییانە، بۆیە خەیاڵی ئەوە دەکات، کە چی ئەم پێویستییە تێر دەکات، کە ئامانجەکەیە، لە ڕێگەی چەند ڕێگەیەکەوە، وەک سواڵکردن یان قەرزکردن، بۆیە سواڵکردن هەڵدەبژێرێت و ئیرادەکەشی بەدوای بەدیهێنانی ئەو ئامانجە دەچێت، لە ڕێگەی چالاکییەکی دەروونی پاڵ بە دەستی دەنێت، جوولەیەک ئەنجام بدات، کە بە سواڵکردن بەرجەستە دەبێت[2]. ئیرادە بەندە بەو ئامانجەی کە تاوانبار دەیەوێت بەدەستی بێنێ و کاریگەری لەسەر پاڵنەر یان ئامانج نییە، چونکە پاڵنەر ئەو فاکتەرە دەروونییە، کە وا دەکات کردەوەیەکی دیاریکراو بسەلمێت، سەرچاوەی پاڵنەری هەست یان بەرژەوەندی

ش. س. م.

١- سەیری بڕیاری دادگای نەقضی میسری بکە ژمارە ٥٧٢ لە ١٩٣٤/٣/١٢ کە لە ماڵپەڕەکەیان بلاوکراوەتەوە.

٢- د. سمیر عالیه، شرح قانون العقوبات القسم العام مصدر سابق ص٢٤٥.

تاوانبارەکەیە[1]، ئامانج مەبەستی دووری ئیرادەیە، ، پاڵنەر و ئامانج نابنە توخمی مەبەستی تاوانکاریی، لە یاسای سزادان پاڵنەر و ئامانج بە هەند وەرناگیرێن، ئەمەش لە زۆربەی یاساکاندا هاتووە[2]. بەهەمان شێوە یاسادانەری عێراق لە یاسای سزادانی هەموارکراوی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩دا باسی پاڵنەری کردووە و ئاماژەی بەوە کردووە کە پاڵنەر لە ئەنجامدانی تاوان لە بەرچاو ناگیرێت[3]. یاسادانەر لەم کارەدا سەرکەوتوو بوو، چونکە پاڵنەر توخمێکی تاوانەکە نییە، ئیرادە لە جەوهەرەکەیدا تاوان نییە، بەڵام ئەگەر هێزەکەی بە ئاراستەی بەدیهێنانی کردارێک کە یاسا بە تاوانی دەزانێ، جولەی پێکرا، ئەوا سیفەتێکی تاوانکاریی بەدەست دەهێنێت، ئیرادە دەبێتە پێشێلکاری یاسا، پێی دەوترێت ئیرادەی گوناهبار، چونکە هەنگاو بەرەو ئەنجامدانی رەفتارێکی تاوانکاریی دەنێ، دەشێت ئیرادە لە کرداری ڕەوا یان نارەوا خۆی نمایش بکات[4]. بۆیە کاتێک ئیرادە بەرەو کارێکی نارەوای ئاراستە دەکرێت[5]، وەک سواڵکردن یان دەرۆزەکردن، ئەوا ئیرادەیەکی گوناهباریان دەبێت و شایەنی ئەوەیە سزا بەسەر ئەنجامدەرەکەی بسەپێ، بەهۆی پێشێلکردنی بڕگەکانی یاسا. سەبارەت بە چوارچێوەی ئیرادە، ئەوا خۆی لە ئیرادەی ڕەفتاری تاوانکاریی و ئیرادەی ئەنجامی

ش. س. م.

١- د فخري عبد الرزاق الحديثي شرح قانون العقوبات القسم العام مصدر سابق ص٢٨٨، المادة ٣٨ من قانون العقوبات العراقي. هەروەها سەیری: د. شاكر سليمان محمد، الباعث واثره في المسؤلية الجنائية، اربيل مطبعة هيفي، ٢٠٢٣، ص٣٥.

٢- د اشرف توفيق شرح قانون العقوبات القسم العام . مصدر سابق ص١٥٧

٣- المادة ٣٨/ قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

٤- د. صابرين محمد، الباعث في القانون الجنائي، مكتبة الوفاء، مصر، الاسكندرية، ٢٠١١، ص٧٦.

٥- د. نظام توفيق المجالي، مصدر سابق ص٣٤٢

تاوانكاريی بەرجەستە دەكات، بەهۆی ئەوەی تاوانی سواڵكردن بە تەنها ئەنجامدانی ڕەفتاری سواڵكردنە ڕوودەدات، ئەوا ئیرادەكە بزوێنەری بنەرەتـی ئەو رەفتارەیە بەرەو تاوانكاریی سواڵكردن [1]. لەوەی باسمانكرد، ڕوون دەبێتەوە كە زانین و ئیرادە بۆ پێكهێنانی مەبەست تاوانەكە، یەكتری تەواو دەكەن، لەبەرئەوەی تاوانی سواڵكردن لە تاوانە بەئەنقەستەكانە، بۆ بەدیهاتنی پێویستی بە زانین و ئیرادە هەیە. نەوەك مەبەستێكی تایبەت.

ش. س. م.

١- د. نظام توفيق المجالي، مصدر سابق، ص ٣٣٤

# باسی دووەم
# ڕووبەڕووبوونەوەی سزایی دیاردەی تلوانی سواڵکردن

ئەم باسە دەکەین بە دوو تەوەر: یەکەمیان، تەرخانی دەکەین بۆ باسکردنی سزایی سواڵکردن، ئەمەشیان دابەش دەکەینە سەر دوو لق: یەکەمیان بۆ سزا ئەسڵیەکانە، کە بەسەر سواڵکەردا دەسەپێندرێت، دووەمیان، تەرخان دەکەین بۆ ئەو ڕێوشوێنانەی کە بەسەر نەوجەوانانـدا دەسەپێندرێت. لە تەوەری دووەمیش باسی ئەو حاڵەتە تاکانەی سزا دەکەین لە میانەی دوو لقدا: یەکەمیان باسی بارودۆخی توندە گشتییەکان و لە دووەمیان بۆ بارودۆخی توندە تایبەتیەکان تەرخان دەکەین.

## تەوەری یەکەم
## سزا

سزا بۆ خۆی ئامانجێک نییە، بەڵکو ئامرازێکە کە دوو ئامانجی هەیە: یەکەمیان چارەسەرییە و دووەمیان خۆپارێزییە، ئامانجی چارەسەریی بریتییە لە ملکەچکردنی سزادراو بۆ ئەو ڕێوشوێن و ڕێنماییانەی کە پێویستیەتی بۆ ئەوەی بتوانێت چاک ببێتەوە، ئامانجی خۆپارێزیش بریتیە لەوەی لە ڕووی ئەخلاقی و هەڵسوکەوتەوە بەهێزبکرێت و وای لێبکرێت تووشی مەترسییەکانی لادان و تاوان

نەبێــت، ســزا تێڕوانینێکــی خۆپــارێزییە بــۆ ئایینــدە[1]. ســزا لەلایەن یاسادانەری عێراقەوە پێناسە نەکراوە، بەڵام فیقهـ وا پێناسـەی کردووە: ( کە بـێ بەهـاکردن یـان زەوتکردنـی هەمـوو یـان بەشـێکە لە مـافە کەسـییەکان، ئەنجامـدەری کـردەوە تاوانکـارییەکە وەک دەرئەنجـامی یاسایی تاوانەکەی تووشی ئازارێک دەبێت، ئەمەش بە ڕێکاری تایبەت و بە ئاگاداری دەسەڵاتێکی دادوەری)[2]. سزاکە لە بەرژەوەندی کۆمەڵگا یەکلایی دەکرێتەوە، نەک لە بەرژەوەندی قوربانی، بەو پێیەی کۆمەڵگا بە خاوەنی ماف دادەنرێت و بۆی هەیە داوای سەپاندنی سزاکە بکات[3]. یاســادانەر مــافی ئەوەی بە داواکــاری گشــتی داوە، کە داوای یاســایی تۆمار بکات، دژی مافی گشتی و کەیسەکانی گەندەڵی دارایی و ئیداری و بەدواداچوونیان[4]. بەهـۆی مەترسـی سـزا وەک ڕێکارێک، بەو پێیەی کـاریگەری لەســەر مـافە سـەرەتاییەکانی تـاک هەیە، زۆربەی یاسـاکان ڕێککەوتــوون لەســـەر ئەوەی ســزاکە وەک بنەمــایەک بــۆ بنەمــای شەرعییەت. تەنها یاسادانەر دەتوانێ لە بەرامبەر کردەیەکی دیـاریکراو بڕیـاری ســزاکە دیـاری بکـات، ئەمەش لە یاسـای سـزادانی عێراقـی هەمـوارکراوی ١١١ی سـاڵی ١٩٦٩دا هـاتووە: (نابێت هـیچ سـزایەک بۆ

ش. س. م.

١- د. عصمت عدلي، مصدر سابق ص٢٩٠.

٢- محمد عبد اللطيف، فرج شرح قانون العقوبات القسم العام النظرية العامة للعقوبة والتدابير 'مطابع الشرطة للنشر والتوزيع ٢٠١٢, ص ٥٠

٣- د مدحت محمد عبد العزيز قانون العقوبات القسم العام النظرية العامة للعقوبة والتدابير الاحترازية مصدر سابق ص ١٦

٤- المادة ٥ أولا من قانون الادعاء العام رقم ٤٩ لسنة ٢٠١٧ العراقي، کە تێیدا هـاتووە: (داواکاری گشـتی ئەم ئەرکـانە دەگرێتە ئەسـتۆ: تۆمـارکردنی سـکاڵای یاســـایی لەســـەر دۆســـیەکانی گەنـــدەڵی گشـــتی و دارایـــی و کـــارگێڕی و بەدواداچوونیـان بە پشتبەسـتن بە یاسـای هەمـوارکراوی ڕێکـاری تاوانکـاری ژمارە ٢٣ی ساڵی ١٩٧١)

کردەوەیەک یان نەکردنی کارێک لەکاتی ئەنجامدانی هەبێت، مەگەر لەسەر بنەمای یاسایەک، هەروەها نابێت هیچ ڕێوشوێنێکی خۆپارێزی بگیرێتەبەر، تا یاسا ئەو ڕێوشوێنانەی دیاری نەکردبێت).[1] ئامانجی یاساکەش سڕینەوەی ئەو دەستدرێژییانەیە، کە تاوانەکە دروستی کردووە، هەروەها دەبێت یاساکە توانای بەرپەرچدانەوەی گشتی هەبێت، کە خۆی لە ئاگادارکردنەوەی هەموو خەڵک دەبینێتەوە، بەوەی هەڕەشەیان لێ بکات، ئەوەی ئەو کردە تاوانکارییە ئەنجام بدات سزا دەدرێت، چونکە بەرپەرچدانەوەی گشتی ڕۆڵی هەیە لە ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسی تاوانکاری[2]. سزادانیش وەک جەزایەک تەنها لەسەر بنەما و پاڵپشتی بڕیارێکی دادوەریی دەبێت، ئەمەش لە یاسای یاسای بنەمەکانی دادگاییکردنی سزای عێراقدا هاتووە: (ناشێت ئەو سزا و ڕێوشوێنانەی کە لە یاسادا بۆ هەر تاوانێک دیاریکراون، جێبەجێ بکرێت، مەگەر ئەوەی بەپێی یاسا بڕیاری جێبەجێ کردنی دراوە، لەلایەن دادگایەکی تایبەتمەندەوە بڕیارەکە دەرچووە)[3]، ئەم سزایەش بۆ چاککردنی تاوانبارەکەیە.

ئەم تەوەرەش دابەش دەکەینە سەر دوو لق، یەکەمیان بۆ باسکردنی سزا بنەڕەتییەکان دووەمیان بۆ ئەو ڕێوشوێنانەی کە دەبێ بەسەر نەوجەواناندا بسەپێنرێن.

ش. س. م.

١- المادة ١ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩

٢- د. محمد عبد اللطيف فرج المصدر السابق ص ٦٩

٣- المادة ٢٨٠ من قانون أصول المحاكمات الجزائية العراقي رقم ٢٣ لسنة ١٩٧١ المعدل.

## لقی یەکەم
## سزا بنەڕەتییەکان

لەم بەشەدا باس لە سزا ئەسڵییەکان (بنەڕەتییەکان) دەکەین، کە بەسەر تاوانی سواڵکردن دەسەپێ، بەو پێیەی یەکێکە لەو تاوانە کۆمەڵایەتیانەی، کە تێیدا سزاکە بۆ پاراستنی زەوقی گشتی دەسەپێندرێت، لە هەراسانکردن و زیانگەیاندن بە خەڵک لەلایەن ئەنجامدەرانی ئەو تاوانانەوە، هەروەها بۆ پاراستنی سەردانی کەرانی شوێنە گشتیەکان و ڕێگا گشتیەکان، وەک یاسادانەر مەرجی بانگەشەی داناوە، لێرەدا مەبەست لە بانگەشەکردن (اعلان) بانگەشەی واقع نییە، بەڵکو جاڕدانی پەیوەست بە شوێن هەیە[1]، جەوهەری سزاکە ئازارە، بەڵام مەبەست لێی سووکایەتیکردن نییە بە کەرامەتی سزادراوەکە، یان زەلیلکردنی یان سووککردنی بێت، بەڵکو مەبەست لە سزاکە دەستبردنە بۆ یەکێک لەو مافانەیە، کە بە خودی تاوانبارەکەوە بەستراوەتەوە[2]. ئەم ئازارە بۆ کاریگەری دانان لەسەر ئیرادەی سزادراوەکە دەقۆزرێتەوە، ناچاری دەکات دەستبەرداری بەها کۆمەڵایەتییە گەندەڵ و خراپەکان بێت و بەرەو بەها باش و نموونەییەکان هەنگاو بنێت[3]. سزا ئەسڵییەکان سزای جۆراوجۆرن، یاسادانەری عێراقیش لە یاسای سزادانی هەموارکراوی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩دا ئاماژەی پێکردووە[4]:

ش. س. م.

١- د. محروس نصار الهيتي، مصدر سابق ص٣٧ و ٤٣

٢- د. مدحت محمد عبد العزيز، مصدرسابق ص ١٨

٣- د. محمد عبد اللطيف، مصدر سابق ص٥٩

٤- لە ماددەی ٨٥ی یاسای عێراقدا هاتووە کە سزای سەرەکی بریتییە لە "مردن، زیندانیکردن، زیندانیکردنی کاتی، زیندانیکردنی سەخت، زیندانیکردنی سادە،

بەو پێـیەی زینـدانیکردن سـزای ئەسـڵییە بـۆ تـاوانی سـواڵکردن، یاسادانەریش زیندانیکردنی کردۆتە سزای ئەسڵی و باسی غەرامەکردن نەکـردووە[1]، زینـدانیکردنیش لە سـزایانەیە کە ئـازادی مـرۆڤ زەوت دەکات، کە تێیدا سزادراو ئازادی کەسی خۆی لەدەست دەدات بە دانانی لە دامەزراوەیەکـی سـزادان[2]. سـەبارەت بە یاسـادانەری عێـراقیش زینـدانیکردنی کـردە یەکێک لە سزا ئەسڵیەکان، هەروەهـا زینـدانیکردن لەسـەر تـاوانی سـواڵکردنی کـردە سـزای واجب، یاسـادانەری عێراقـی زینـدانیکردنی بە گوێرەی مادەکانی ٨٨ و ٨٩ باسـکردووە، هەروەهـا لە یاسـای سـزدانی عێراقـی ژمـارە١١١ی سـاڵی ١٩٦٩ هەمـوارکراو باسکردووە، بە پێی یاساکانی عێراق زیندانیکردن دوو جۆرە: زیندانی (توند) دانانی سزادراو لە یەکێک لەو دامەزراوە سزاییە تایبەتمەندانەی، کە بە یاسا بـۆ ئەم مەبەسـتە دیـاری کـراوە، بـۆ ئەو مـاوەیەی کە لە حوکمـدانەکە دیـاری کـراوە[3]. دەبێـت کـاری پـێ بکرێـت، ئەگەر مـاوەی زیندانیکردنەکە زیاتر لە ساڵێک بێت. سەبارەت بە زیندانیکردنی (سـادە)، ئەوا دانـانی سـزادراوەکەیە، لە یەکێـک لە دامەزراوە سـزاییەکان تایبەتمەندەکان کە یاسا دیاریکردووە، بۆ ئەو ماوەیەی کە لە بڕیارەکەدا دیـاری کـراوە[4]، بەو پێـیەش سـزای زینـدانیکردنی قـورس بـۆ تـاوانە بچووکەکان دیاری کراوە، لەکاتێکدا سزای زیندانیکردنی سادە بۆ تـاوان و سـەرپێچی دیـاری کـراوە، بـۆیە ئـێمە ڕووبەڕووی سـەرپێچییەک

---

غەرامەکردن، ڕاگرتن لە قوتابخـانەی کوڕانی تاوانبـار و ڕاگرتن لە قوتابخـانەی چاکسازی".

١- المادة ٣٩٠/١ قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل.

٢- مدحت محمد عبد العزيز المصدر السابق ص ٧٣

٣- المادة ٨٨ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

٤- سەیری: المادة ٨٩ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

دەبینەوە ئەگەر سزای زیندانیکردن لە ٢٤ کاتژمێر کەمتر نەبێت و لە سێ مانگیش زیاتر نەبێت[١]، بەم پێیە تاوانی سواڵکردن لە یاساکانی عێراقدا "سزا دەدرێت بە زیندانیکردن بۆ ماوەی مانگێک کەمتر نەبێت و لە سێ مانگ زیاتر نەبێت بۆ هەر کەسێک کە تەمەنی هەژدە ساڵی تەواو کردبێت، ئەگەر بینرا سواڵ دەکات لەسەر ڕێگایەکی گشتی یان لە شوێنە گشتیەکان، یان بەبێ مۆڵەت بچێتە ماڵێک یان پاشکۆی ماڵەکە بە مەبەستی سواڵکردن)[٢]. سواڵکەر لە ماوەی سزاکەیدا لە بەندیخانە بۆ هیچ کارکردنێک ڕاناسپێردرێت[٣]. سەبارەت بە سزا لاوەکییەکان، کە سزای پاشکۆیی و تەواوکەرین و بۆ وەرگرتنی ڕێوشوێنی خۆپارێزیین دەگیرێنەبەر، بۆمان دەرکەوت، کە لە یاساکانی عێراقدا بەسەر تاوانی سواڵکردن ناسەپێن.

دەستبەسەراگرتن (المصادرة) لەلایەن یاسادانەری عێراقی لە یاسای سزادانی عێراقی لە دوو حاڵەتدا مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، یەکەمیان: لەنێو ئەو سزا تەواوکەرانەیە، کە یاسادانەری عێراق لە یاسای سزادانی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩دا دیاریکردوون، وەک لە مادەی ١٠١ی هەموار کراوەتەوە[٤]، دەبینین کە هیچ بوارێک نییە بۆ

ش. س. م.

١- د. فخري عبد الرزاق الحديثي شرح قانون العقوبات القسم العام مصدر سابق، ص ٣٩٧.

٢- المادة ٣٩٠/١ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

٣- د. اكرم نشأت القواعد العامة في قانون العقوبات المقارن مصدر، سابق، ص ٣١٦ .

٤- بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: مادەی ١٠١ی یاسای سزادانی عێراقی، کە دەڵێت: (جگە لەو حاڵەتانەی کە یاسا داوا دەکات بڕیاری دەستبەسەرداگرتن بدرێت، دادگا دەتوانێت لەکاتی سزادانی بە تاوانێکی گەورە یان تاوانێکی کەمدا، فەرمانی دەستبەسەرداگرتنی دەستبەسەرداگیراوەکە بدات ئەو شتانەی کە لە تاوانەکە بەدەست هاتوون یان کە لە ئەنجامدانیدا بەکارهێنراون یان کە مەبەست لێی

سەپاندنی سزای دەستبەسەراگرتن بەسەر تاوانی سوالّکردندا، چونکە یاسادانەر دەستبەسەرداگرتنی لە سیستەمی تاوانەکانی تاوانکاری دەرهێناوە و مەرجی دانا، کە تاوانەکە تاوانێکی گەورە بێت یان تاوانێکی بچووک (کەتن) بێت بۆ دەستبەسەرداگرتن، لەو دەقە یاساییانەی، کە مامەڵە لەگەڵ سوالّکردندا دەکەن، دەستبەسەرداگرتنی پارە لە دەستی سوالّکەرەکەدا نەبینیووە، بە تاوان دانرابێت و دەبێت دەستی بەسەردا بگیرێت. هیوادارین یاسادانەری عێراقی ئەم کەموکورییە چارەسەر بکات، ئەو پارەیەی لە دەستی سوالّکەردایە بە تاوانی سوالّ کۆی کردۆتەوە پێویستە دەستی بەسەردا بگیرێت، حاڵەتی دووەم یاسادانەر مامەڵەی لەگەڵ دەستبەسەرداگرتن کردووە، لە بەشی چوارەمیدا لە ڕێوشوێنە خۆپارێزییە مادییەکان، بۆیە دەبینین کە هیچ بوارێک نییە بۆ دەستبەسەرداگرتن، وەک ڕێکارێکی خۆپارێزی بۆ تاوانی سوالّکردن، چونکە بابەتی دەستبەسەرداگرتن ئەو شتانەیە کە دەستیان بەسەردا گیراوە، بە دروستکردنیان، یان هەڵگرتنیان یان بەدەستهێنان، یان بەکارهێنان، یان فرۆشتن، یان خستنەروو بۆ فرۆشتن، ئەمانە لە خۆیاندا تاوانن، تەنانەت ئەگەر خاوەنداریتی بۆ تۆمەتباریش نەگەڕێتەوە، یان لەسەریان سزا نەدرابێت[1]. دەبینین کە ئەو سزایە بەسەر سوالّکردندا ناسەپێت، چونکە ئەو پارەیەی لەدەستی

---

بەکارهێنان بووە." و هەموو ئەمانە بەبێ زیانگەیاندن بە مافەکانی لایەنی سێیەمی ڕاستەقینە، و دادگا دەبێت لە هەموو حاڵەتەکاندا فەرمانی دەستبەسەرداگرتنی ئەو شتانەی دەستی بەسەردا گیراوە کە وەک کرێیەک بۆ ئەنجامدانی تاوانەکە بەکارهێنران.

١- بۆ زانیاری زیاتر سەیری: مادەی ١١٧ لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی سالّی ١٩٦٩.

سواڵکەردایە، بە تاوان هەژمار نەکراوە، داوا لە یاسادانەر دەکەین کە ئەو پارانە بە تاوان دابنێ و بریاری دەستبەسەراگرتنی بدات.

## لقی دووەم
## ئەو ڕێککارانەی کە بەسەر نەوجەوان دەسەپێنرێن لە تاوانی سواڵکردن دا

فیقهـ ڕێوشوێنی بەم شێوەیە پێناسە دەکات: (کۆمەڵێک ڕێککاری چارەسەریین، کە کۆمەڵگا چاودێری دەکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کێشانەی، کە مەترسی کۆمەڵایەتین)[1]، ئەمانەش چەند ڕێککارێکی تاوانکارین، کە بەناوی خەڵکەوە لەلایەن دەسەڵاتی دادوەرییەوە جێبەجێ دەکرێن، هەندێکی دیکە بەم جۆرێک پێناسەیانکردووە: (جۆرە ڕێککاریەکە، بڕیاری دادوەری پێ دەردەچێت، بۆ ئەوەی کۆمەڵگا لەو مەترسییە بپارێزێت و دووربخاتەوە، کە بەشاراوە لەلایەن کەسانی کاری نارەوا دروستی دەکەن)[2]. یاسای بنەماکانی دادگایکردنی سزایی عێراقی (قانون أصول المحاكمات الجزائية العراقي) ئەو سزایەی کە بەسەر هەرزەکار دەسەپێ، وەک ڕێوشوێنێک دایدەنێ[3]، ئەو ڕێوشوێنەی کە بەسەر نەوجەوانەکەدا دەسەپێندرێت مەبەست لێی ئازاردانی نییە، بەڵکو مەبەست لێی چاکسازی و ڕاستکردنەوەیەتی،

ش. س. م.

١- د. مدحت الديبسي، محكمه الطفل والمعاملة الجنائية للأطفال دار الجامعة الجديدة الإسكندرية ص٨٣

٢- د. فوزية عبد الستار, مبادئ علم الاجرام والعقاب, دار النهضة القاهرة ١٩٧٢ ص ١٨٨.

٣- المادة ٢٣٨/ج قانون أصول المحاكمات الجزائية العراقي المعدل کە دەڵێت: (ئەو سزایەی کە بەسەر هەرزەکاردا دەسەپێ، پێی دەگوترێت ڕێککاریی).

پێویسته مامەڵەی تاوانبارانه لەگەڵ نەوجەواندا بکرێت به شێوەیەکی که لەگەڵ پێویستی و مەرجەکانی چاکسازییەکەیدا بگونجێت[1]. نەوجەوان ئەو کەتنکەرەیە که کارێکی ئەنجامداوە و لەسەری سزا دەدرێت، چونکه کارەکەی کاریگەری لەسەر ئاسایش و سەلامەتی کۆمەڵگا هەیە، وا پێویست دەکات بدرێته دادگا و بەپێی بریارێکی دادوەری رێککاری خۆپارێزی گونجاوی بەسەردا بسەپێنرێت وەک ئەوەی له یاسا بریاری لێدراوە[2]، یاسادانەری عێراق له تاوانی سواڵکردن به تایبەت جیاوازی له نێوان ئەوانەی هەژدەیان تەواو کردووە لەگەڵ ئەوانەی تەواویان نەکردووە دەکات، بڕگەکانی بەرپرسیارێتی نەوجەوانان له ئەگەری ئەنجامدانی سەرپێچییەکدا بەسەریان جێبەجێ دەکات[3]. ئەو رێوشوێنانەی که یاسادانەر له حاڵەتی ئەنجامدانی سەرپێچییەکی نەوجەواندا دیاریی دەکات، بریتیه له بڕگەکانی مادەی ٧٢ی یاسای چاودێریکردنی نەوجەوانانن، که تێیدا هاتووە: (ئەگەر نەوجەوان سەرپێچییەک ئەنجامبدات، ئەوا له دانیشتنەکەدا ئامۆژگاری دەکرێت، که کارێکی نارەوای کردووە و نابێت دووبارەی بکاتەوە، یان ڕادەستی سەرپەرشتیارەکەی یان یەکێک له خزمەکانی دەکرێتەوە، ئەو خزمەی ئەو ڕاسپاردانەی دادگا بریاری لەسەر داوە، جێبەجێ بکات، تاکو زامنی پەروەردە و رەفتارێکی جوان بکات، بۆ ئەمەش پێویسته بەڵێن

ش. س. م.

١- د. مدحت محمد عبد العزيز، قانون العقوبات القسم العام النظرية العامة للعقوبة، مصدر سابق، ص ٢٨٢

٢- أكرم نشات إبراهيم، مصدر سابق ص٤٢٨.

٣-المادة ٣٩٠/٢ قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل. که تێیدا هاتووە که "ئەگەر ئەنجامدەری ئەم کردەوانە تەمەنی له خوار هەژدە ساڵەوە بێت، ئەوا بڕگەکانی بەرپرسیارێتی نەوجەوانان له ئەگەری سەرپێچییەکدا بەسەریدا دەسەپێت".

نامەیەکی دارایی کە لە ٥٠٠٠٠ دینار کەمتر نەبێت و زیاتر نەبێت لە ٢٢٠٠٠٠ دینار بۆ ماوەی شەش مانگ کەمتر نەبێت و لە ساڵێک زیاتر نەبێت، یان سزای غەرامەکردنی بەسەردا دەسەپێنرێت).

**یەکەم: ئاگادارکردنەوە**

یەکێکە لە ڕێوشوێنە بەدیلانەی زەوتکردنی ئازادییە، بە ڕێککارێکی چاکسازی دادەنرێت، دەرهەق بەو نەوجەوانەی کە لەبەردەم دادگاکاندا سکاڵای لەسەر تۆمار دەکرێت، هەزرەکارەکە خۆی یان سەرپەرشتیارەکەی بەنووسین یان بە زارەکی ئاگادار دەکرێتەوە، کە جارێکی دیکە کردەوەی پێشێلکاری و نایاسایی ئەنجام نەدات[1]. ئاگادارکردنەوەش شتێکی ناچاریی نییە، بەڵکو دادگا بۆی هەیە ڕێوشوێنی تر هەڵبژێرێت، ئەمەش ئەوەیە کە یاسای نەوجەوانانی عێراقی دیاریی کردووە، کاتێک نەوجەوانەکە سەرپێچییەک ئەنجام دەدات[2]، هۆشدارییەکە بە واتای "ئاگادارکردنەوە لە دووبارەبوونەوەی تاوانکاری دێت، ئاگادارکردنەوەکە لەلایەن دادوەرەوە بۆ نەوجەوان لە کاتی دانیشتنەکەدا بە شێوەیەکی ئاشکرا ئاگادار دەکرێتەوە[3]. یاسادانەری عێراقی پێناسەی ئاگادارکردنەوەی نەکردووە، بەڵام لە

ش. س. م.

١- علي حسين ياسين - شرح قانون الأحداث رقم ٧٦ لسنة ١٩٨٣ دراسة تطبيقية دار الجيل العربي -الموصل ٢٠١٢. ص ١٩٨

٢- المادة ٧٢ - من قانون رعاية الأحداث العراقي رقم ٧٦ لسنة ١٩٨٣ المعدل.

٣- د.محمود نجيب حسني، شرح قانون العقوبات اللبناني - مصدر سابق ص: ٥٢٥ أنظر المادة ١٠٢ من قانون الطفل المصري رقم ١٢ لسنة ١٩٩٦

یاسـای سـزادانی عێراقـی ، ژمـاره ١١١ی سـاڵی ١٩٦٩ی هەمـوارکراو، باسی کردووه[1].

هەروەها لە یاسـای هەمـوارکراوی چـاودێری نەوجەوانـانی عێراقـی ژماره ٧٦ی ساڵی ١٩٨٣[2]. بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەر شـێوازێکی دیـاریکراوی هۆشـداری دیـار نەکـردووه ، بـۆیه دەتـوانرێ بە شـێوەی زارەکـی یـان بە نووسـراو بە نەوجەوانەکە رابگەیەنـرێ، بەبـێ ئەوەی دەربڕینـی تونـدوتیژی یـان سەرزەنشـتی تێدا بێـت، بە ئامـادەبوون بە شـێوەیەکی راسـتەوخۆ ئاراسـتەی نەوجەوانەکە دەکرێـت، یاسـادانەر رێگەی نەداوە رێوشوێنی ئاگادارکردنەوە لەگەڵ رێوشوێنێکی تـر تێکەڵ بکرێـت[3]، یاسـادانەر سـەرکەوتوو نەبـوو لە مـادەی ٢/٣٩٠ ، کاتێـک بڕگەکـانی مـادەی ٧٢ی یاسـای چـاودێری نەوجەوانـانی سـەبارەت بە سـوالکردنی نەوجەوان جێبەجـێ کـرد، چـونکە سـوالکردنی نەوجەوان پێویسـتی بە پاراسـتن و چـاودێری هەیە، بە مەترسـی دادەنرێـت، بەو پێیەی سـوالکردن جۆرێکە لە سـەرگەردانی و بـێ لانەیـی[4]. لەم جـۆره

ش. س. م.

١- سـەیری مـادی ٦٩ یاسـای سـزادانی عێراقـی بـکە دەڵێـت: ئەگەر نەوجەوان سـەرپێچی کرد، لەبری ئەو سزایەی کە لە یاسادا بۆ دیاریکراوە، لە دانیشـتنی دادگا ئاگادار دەکرێتەوە.

٢- المادة ٧٢ من قانون رعاية الأحداث العراقي رقم ٧٦ لسنة ١٩٨٣ المعدل، کە دەڵێـت "ئەگەر نەوجەوانەکە سـەرپێچییەک ئەنجامـدا، ئەوا لە دانیشـتنەکەدا ئامۆژگاری دەکرێت کە کارە نایاساییەکەی دووبارە نەکاتەوە."

٣- إیدن خالد قادر - التدابیر العلاجیة للأحداث الجانحین - رسالة دکتوراه مقدمة إلی کلیة القانون - جامعة بغداد - ١٩٩٢ - ص ٢٠ .

٤- سەیری مادەی ٢٤ / یەکەم / لە یاسای چاودێری نەوجەوانانی عێراقی بکە، کە هاتووە تێیدا "منداڵێکی خوار تەمەنی یاسایی یان هەرزەکارێک بە بێ ماڵ و حاڵ هەژمار دەکرێت، ئەگەر لە شوێنە گشتییەکاندا سواڵ بکات، خۆی بریندار

حاڵەتە مەترسیدارانە و حاڵەتەکانی ڕەفتاری لادان، دادگای نەوجەوانان دەتوانێت بڕیارێکی جیاواز لەو ڕێوشوێنانە دەربکات کە لە مادەی ٧٢ بۆ تاوانباری نەوجەوان دیاری کراوە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە سواڵکەر پێویستی بە پاراستن و ڕێوشوێنی خۆپارێزی هەیە، وەک چۆن ڕێوشوێنی جیاواز دیاری دەکات، کە تەنها ڕادەستکردن و داناننیەتی لە شوێنێک، ئێمە ئاگادارکردنەوەمان لەناو ئەم ڕێوشوێنانەدا نەدۆزیەوە[1]، جگە لەوەی کە ئاگادارکردنەوەکە، تەنانەت ئەگەر لە چوارچێوەی ئەو ڕێوشوێنانەشدا هەبێت کە لە مادەی ٧٢ی ئەم یاسایە بۆی دیاری کراوە، بەڵام کاریگەریەکی ئەوتۆی لەسەر سواڵکەری نەوجەوان نییە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەندامانی پۆلیسی دادوەری بەرزەفتکاری، لەگەڵ گرتنی نەوجەوانەکە، لێی دەدەن، یان قسەی ناشرینی پێ دەڵێن، لەبەر هەموو ئەو هۆکارانە پێشنیار دەکەین یاسادانەر دەقی مادەی ٣٩٠/٣ ی یاسای سزادان هەموار بکاتەوە و ئەو ناکۆکیەی هەیە لابەرێت و وابکات تەنها مادی ٢٦ی ئەو یاسایە بۆ نەوجەوانی سواڵکەر تایبەتمەند بکرێت.

**دووەم: ڕادەستکردن**

مەبەست لە ڕادەستکردن، واتا دانانی نەوجەوانەکە لەلای کەسێک کە سەرپەرشتیاری هەبێت بەسەریدا بە مەبەستی چاودێریکردن و گرنگی دان پێی و ڕێگریکردن لێی نەوەک کردەوەیەک پێچەوانەی

---

یان کەمئەندام پیشان بدات ، یان فێڵ وەک ئامرازێک بۆ پەیداکردنی پارە بەکاربهێنێت*.

١-بڕوانە: مادەی ٢٦ لە یاسای چاودێری نەوجەوانانی عێراقی ژمارە ٧٦ی ساڵی ١٩٨٣، وەک هەموار کراوە.

ئەحكامەكـانی یاسـا ئەنجـام بـدات[1]. دەبینـین، كە یاسـادانەری عێـراق پێناسـەی رادەسـتكردنی نەكـردووە، ئەگەرچـی لە یاسـای نەوجەوانانـدا باسی ئەوەی كردووە، كاتێک نەوجەوانەكە سـەرپێچییەكی ئەنجامبدات، دەبێت ڕادەسـتی سەرپەرشـتیاری خۆی یان یەكێک لە كەسـوكارەكانی بكرێت، بۆ ئەوەی ئەو ڕاسپاردانەی بەسـەردا جێبەجێ بكات، كە دادگا پێی دەدات[2]، ڕادەستكردن بەپێی یاسـای نەوجەوانانی عێراق لە تـاوانی سەرپێچی كردن و كەتن ڕێگەپێدراوە، بەو پێیەی سـواڵكردن بە یەكێک لە شـێوەكانی بێلانەیی دادەنرێت، نەوجەوان تووشـی مەترسـی دەبێت، دادگای نەوجەوانان دوای وەرگرتنی ڕاپۆرتی نووسـینگەی تـوێژینەوەی كەسایەتی، بڕیارەكەی دەردەكات، بەپێی ئەمانەی خـوارەوە: (منـداڵ یـان نەوجەوانەكە ڕادەسـتی سـەرپەرشـتیارەكەی دەكرێت بـۆ جێبەجێكردنـی پێشنیارەكانی دادگا لە ژێر ڕۆشـنایی ڕاپۆرتی فەرمـانگەی لێكۆڵینەوەی كەسـایەتیدا، بـۆ دڵنیـابوون لە پەروەردەكـردن و ڕەفتـاری بـاش، بەپێـی بەڵێننامەیەكی دارایی گونجاو[3]) هەروەها: (منـاڵ یان نەوجەوان رادەسـت دەكرێـــت، ئەگەر هـــاتوو هـــیچ سەرپەرشـــتیارێكی نەبێـــت، یـــان

ش. س. م.

١- اقبال الفلوجي، نحو سياسة جنائية حديثة مجلة العدالة العدد ١ ١٩٧٦ ص ٣٧٦

٢- لە مـادەی ٧٢ی یاسـای چـاودێری نەوجەوانـانی عێراقـی ژمـارە ٧٦ی سـاڵی ١٩٨٣دا هـــاتووە كە (ئەگەر نەوجەوانەكە ســـەرپێچییەک ئەنجامبـــدا، ئەوا لە دانیشتنی دادگادا ئامۆژگاری دەكرێت بۆ ئەوەی كـارە نایاسـاییەكەی دووبـارە نەكاتەوە، یان ڕادەستی سەرپەرشتیاری نەوجەوانەكەی یان یەكێک لە خزم و كەسـوكارەكەی دەكرێت، بەجۆرێک ئەو ڕاسپاردانەی كە دادگا بڕیـاری لەسـەر داوە، جێبەجێ بكات بۆ دڵنیابوون لەوەی پەروەردە و ڕەفتـارێكی باشـی دەداتێ، لەژێر بەڵێننامەیەكی داراییدا لە ٥٠٠٠٠ دینار كەمتر نەبێت و لە ٢٢٠٠٠٠ دینـار زیاتر نەبێت، بۆ ماوەیەكی كەمتر نەبێت لە شـەش مانگ و زیـاتر نەبێت لە یەک ساڵ، یان غەرامەی بەسەردا دەسەپێنرێت.

٣-المادة ٢٦ / أولا // من قانون رعاية الأحداث العراقي رقم ٧٦ لسنة ١٩٨٣

سەرپەرشــتیارەکەی ئەو بەڵێــنەی کە لە بــرگەی ( أ )ی بەنــدی یەک دیاریکرابوو، جێبەجێ نەکرد، دووبارە منداڵەکە رادەستی خزمێکی چاکی دەکرێت لەسەر داوای خۆی بۆ ئەنجامدانی ئەوەی دادگا بریاری لەسەر دەدات، لە ڕاســپاردەکان، لە ژێــر رۆشــنایی ڕاپــۆرتی نووســینکەی تــوێژینەوەی کەسـایەتی، بـۆ دڵنیـابوون لە پەروەردەکـردن و ڕەفتـاری باشی لە ژێر بەڵێنێکی دارایی گونجـاودا)[1]. ئەگەر نەتوانرا نەوجەوانەکە ڕادەسـت بکرێت، دادگـا دەتوانێت بیخـاتە خـانەیەک لە خانەکـانی سـەر بەدەوڵەت[2]. یاسادانەری عێراقی بەپێی مـادەی ٢٦ی یاسـای چاودێری نەوجەوانــان دەبینــین، ئەو ڕێوشــوێنێکی ســەپاندووە، کە گرنگترینیــان رادەستکردن و دانانە و هیچی تر نـادۆزینەوە، بۆمـان دەردەکەوێت کە ئەم ڕێوشوێنە گونجاون بـۆ ئەوەی نەوجەوانە سـواڵکەرەکە بیپارێزێت، وەک ڕێکارێکی خۆپارێزی، کە بۆ ئەوەی تووشی لادان نەبێت. دانـانی نەوجەوان لە خانە و دامەزراوە تایبەتمەندەکانی دەوڵەت، حاڵەتێکی زۆر گرنگە بۆ پارێزگاریکردن لە نەوجەوانـی سـواڵکەر، بەم شـێوەیە بۆمـان دەردەکەوێــت کە ڕێوشــوێنەکانی مــادەی ٢٦ی یاســای چــاودێری نەوجەوانــان بــۆ ســواڵکەران، لە ڕووی پانتــاییەوە فراوانتــرە لەو ڕێوشوێنانەی کە لە مادەی ٧٢ی ئەم یاسایەدا هاتوون.

سێیەم: ڕادەستکردن

ش. س. م.

١- المادة ٢٦ / أولا/ ب: من قانون رعاية الأحداث العراقي رقم ٧٦ لسنة ١٩٨٣

٢- المادەی ٢٦ / سێیەمی یاسای چاودێری نەوجەوانانی عێراقی ژمارە ٧٦ی ساڵی ١٩٨٣ کە تێیدا هاتووە "ئەگەر دادگا نەیتوانی بە پێی برگەی یەکەمی ئەم مـادەیە ئەو گەنـجە یـان نەوجەوانە ڕادەسـت بکـات، ئەوا بـرگەی ب لە بـرگەی دووەمـی ئەو یاسا جێبەجێ دەکرێت"

یاسـادانەری عێـراق غەرامەی لە نێـو سـزا ئەسڵیەکانی یاسـای سزادانی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩، هەموارکراوی داناوە[١]. وا پێناسـەی غەرامەکەی کردووە (پابەندکردنی سزادراو بە پێدانی بڕە پارەیەیەک بە گەنجینەی گشتی، بە گوێرەی ئەو بڕیارەی کە دادگا دیاریکردووە)[٢]. لە یاسای چاودێری نەوجەواناندا، غەرامەکردنەکە لە سەرپێچی دانراوە[٣]، هەروەها بە تاوان یان کەتنی هەژمارکردووە، وەک یاساکە باس لەوە دەکات کە: (دادگای نەوجەوانان بۆی هەیە سزای غەرامە بخاتە سەر نەوجەوان، لە تاوانێکی گەورە یان تاوانێکی بچووکدا، کە یاساکە سزای زینـدانیکردن بـۆ مـاوەیەک کە لە حەوت سـاڵ زیـاتر نەبێـت یـان زیندانیکردن، ئەگەر لە ڕاپۆرتی نووسینگەی تـوێژینەوەی کەسـایەتی دەرکەوت کە بـۆ کەیسـەکە وا گونجـاوترە، کە نەوجەوانەکە غەرامە بکرێت نەوەک بەندکردن)[٤] گرتنەبەری ڕێوشوێنی غەرامە، کە لە یاسای نەوجەواناندا هـاتووە، سـیفەتێکی بەرهەڵسـتی هەیە، چـونکە ڕێـژەی غەرامەکە بەپێـی هەبـوون و بەردەسـتبوونی پـارە لای نەوجەوانەکە دیـاری دەکرێـت، نەک لەسـەر بنەمـای ترسـناکی تـاوانەکە[٥]. یاسـادانەر ڕێـگەی نەداوە ئەو نەوجەوانە زینـدانی بکرێـت. کاتێـک ئەو غەرامەیەی بەسەریدا سەپێنراوە، نەدات، بەڵکو بەپێی بڕگەکانی یاسای جێبەجێکردن (تنفیـذ) مـامەڵەی لەگەڵ دەکرێـت[٦]. بەڵام ئـێمە غەرامە لە ڕێکارەکـانی

ش. س. م.

١-المادة ٨٥ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

٢-المادة ٩١ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

٣- المادة ٧٢ من قانون رعاية الأحداث العراقي رقم ٧٦ لسنة ١٩٨٣ المعدل

٤-المادة ٧٨ من قانون رعاية الأحداث العراقي رقم ٧٦ لسنة ١٩٨٣ المعدل.

٥- إيدن خالد قادر, التدابير العلاجية, مصدر سابق ص١٩٢

٦- سـەیری: المـادة ٨٣ مـن قـانون رعایـة الأحـداث العراقـي رقـم ٧٦ لسـنة ١٩٨٣ هەمـواکراو بـکە، کە دەڵێـت: (غەرامەکە بەپێـی بڕگەکـانی یاسـای جێبەجێکـردن ژمارە ٤٥ ساڵی ١٩٨٠ وەردەگیرێت، کاتێک سزادراو ڕەتیدەکاتەوە بیدات)

خۆپارێزیدا کە یاسای نەوجەوانانی عێراق ڕوونی کردۆتەوە، نابینین، کە سوالکەری نەوجەوان ئەنجامی داوە، بەو پێیەی سوالکەری نەوجەوان بە جۆرێک لە بێلانەیی لانەوازەیی دادەنرێت، هەر بۆیە یاسای نەوجەوانان ڕێوشوێنی تایبەتی بۆ دوورکەوتنەوە لێی دیاریکردووە، مەترسی و پاراستنی نەوجەوانان تەنها ڕادەستکردن و دانان لەخۆگرتبوو[1]. بۆیە هیوادارین یاسادانەر بۆ پاراستنی ئەم توێژە، ئەو ناکۆکییەکە هەڵبگرێت و دەقی مادەی ٣٩٠ / ٢/ بەپێی ئەو ڕێوشوێنانەی کە لە مادەی ٢٦ی یاسای نەوجەوانانی عێراقدا هاتووە، هەموار بکاتەوە، بەهۆی ئەوەی غەرامەکردن لەگەڵ سوالکەری نەوجەوان، بەدی نایەت، یاسادانەر ئەو بەرپرسیارێتییەی دەکەوێتە ئەستۆی دایک وباوکان (سەرپەرشتیارانی) لەبیر نەکرد، کاتێک چاودێری هەرزەکاریان پێناکرێت و بەرەو بێلانەیی دەبەن، ئەمەشی لە بەشی سێیەمی یاسای چاودێری نەوجەوانان و سزادانیان بە غەرامە باسکردووە[2]، یاسادانەریش لەوەدا سەرکەوتوو بوو، لە پێناو پاراستنی خێزان، داوای لە سەرپەرشتیاری نەوجەوان کرد، کە چاودێری هەرزەکاری خۆی بکات، لە پێناو پاراستنی قەوارەی خێزان، کە بناغەی کۆمەڵگەیە، لەژێر ڕۆشنایی ئەوانەی لەسەرەوە باسکران، بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەو ڕێوشوێنانەی، کە یاسادانەر دیاریکردووە، لە ئەگەری ئەنجامدانی سەرپێچییەکدا، بڕگەکانی مادەی ٧٢ی یاسای چاودێری نەوجەوانان دەڵێت: (ئەگەر نەوجەوانەکە سەرپێچییەک

ش. س. م.

١-المادة ٢٦ من قانون رعاية الأحداث العراقي رقم ٧٦ لسنة ١٩٨٣

٢-سەیری: مادەی ٢٩، یەکەم، لە یاسای چاودێری نەوجەوانان ژمارە ٧٦ی ساڵی ١٩٨٣، کە تێیدا هاتووە "هەر دایک و باوکێک کەمتەرخەم بێت لە چاودێریکردنی منداڵێکی کەم تەمەن یان هەرزەکار، سزا دەدرێت بە غەرامەکردن کە لە سەد دینار کەمتر نەبێت و لە پێنج سەد دینار زیاتریش نەبێت.

ئەنجامبدا، ئەوا لە دانیشتنی دادگادا ئامۆژگاری دەکرێت بۆ ئەوەی کارە نایاسـاییەکەی دووبـارە نەکـاتەوە، یـان ڕادەسـتی سەرپەرشـتیاری نەوجەوانەکەی یـان یەکێـک لە خـزم و کەسـوکارەکەی دەکرێـت، بەجۆرێـک ئەو ڕاسپاردانەی کە دادگـا بڕیـاری لەسـەر داوە، جێبەجـێ بکات بۆ دڵنیابوون لەوەی پەروەردە و ڕەفتارێکی باشی دەداتێ، لەژێر بەڵێننامەیەکی داراییدا لە ٥٠٠٠٠ دینار کەمتر نەبێت و لە ٢٢٥٠٠٠ دینار زیاتر نەبێت، بۆ ماوەیەکی کەمتر نەبێت لە شەش مانگ و زیـاتر نەبێت لە یەک سـاڵ، یـان غەرامەی بەسـەردا دەسـەپێنرێت). بەڵام بۆمـان دەردەکەوێت کە یاسادانەر کەوتە ناو دژایەتییەکەوە، چونکە ئەگەر بینرا نەوجەوان بۆتە سواڵکەر، لە دۆخێکی مەترسیداردا دادەنرێت و ئەمەش بە یاسای نەوجەوانان پشتڕاست دەکرێتەوە، ئەو یاسایە: سواڵکردنی بە حاڵەتێکی سـەرگەردانی و بێلانەیـی دانـاوە، وەک ئەوەی تێیـدا هـاتووە: (ئەگەر سواڵکەرێک لە شوێنە گشتیەکاندا ببینرێت، یان بە برینداربوون یـان کەمئەنـدامییەک خـۆی نمـایش بکـات، یـان هەر ئـامرازێکی دیـکە فێڵکـردن بەمەبەسـتی ڕاکێشـانی سـۆزی خەڵـک بەکـاربێنێ، بە بـێلانە دادەنرێت)[1]. بۆیە سواڵکەری نەوجەوان پێویستی بە چارەسەرکردن و ڕێکـارێکی خۆپـارێزی هەیە، ئەمەش پـێچەوانەی ئەوەیە کە لە یاسـای سـزادانی عێراقـی دیـاریکراوە، بەو پێـیەی ئەنجامـدانی سـواڵکردنی نەوجەوانـانی کـردۆتە تـاوان، لەکاتێکدا یاسـای نەوجەوانـانی عێراق لە مـادەی ٢٦ی بە ڕادەسـتکردن و دانـان لە شـوێنێک مـامەڵەی لەگەڵـدا کردووە، داوا لە یاسادانەر دەکەین، مادەی ٢/٣٩٠ هەڵبوەشێنێتەوە و بۆ مـادەی ٢٦ی یاسـای نەوجەوانـان بگەڕێـتەوە، چـونکە بە باشـترین و گونجـاوترین دەزانـین، تـاکو لە سـەر سـواڵکەری نەوجەوانـان جێبەجـێ بکرێت.

ش. س. م.

١- المادة ٢٤ من قانون رعاية الأحداث العراقي رقم ٧٦ لسنه ١٩٨٣ المعدل.

## تەوەری دووەم
## تاکڕەوکردنی سزا

ئامانجی سیاسەتی تاوانکاریی، گەیشتن بە باشترین ڕێگاکانی بەرەنگاربوونەوەی تاوانە بە پەیڕەوکردنی ئەو شێوازە زانستیانەی، کە گەرەنتی چاکسازی و شیاندنی تاوانبار و دووبارە تێکەڵبوونەوەی بە کۆمەڵگادا دەکەن[1]. کاتێک یاسادانەر بڕیار لەسەر سزاکەیەک دەدات، بە شێوەیەکی رووت سەیری سزادراوەکە دەکات، ئەو سزایە دەسەپێنێ، کە لەگەڵ گەورەیی کردە تاوانکارییەکە دەگونجێ، تاکو ئەو ئامانجەی خوازراوە بێتەدی، زۆربەی سیاسەتە تاوانکارییەکان پەنا دەبەنە بەر تاکاندنی سزا، کە بەم شێوەیە پێناسە دەکرێت: (بریتیە لە توانی دەسەڵاتی دادوەری و دەسەڵاتی جێبەجێکردن بۆ بەدەستهێنانی جیاوازیی لە مامەڵەی سزایی لە نێوان تاوانباران، بەپێی بارودۆخەکانیان)[2]. هەندێکی دیکە بەو شێوەیە پێناسەیان کردووە: (گونجاندنی سزاکە لەگەڵ بارودۆخی کەسیی تاوانبارەکەدا، کە کە خۆی لە پێکهاتەی جەستەیی و دەروونی و کۆمەڵایەتییەکەی، بارودۆخی پێش و لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکە و دوای ئەنجامدانی تاوانەکە بەرجەستە دەکات، سەرباری رەچاوکردنی ئەو ئامرازانەی کە لە ئەنجامدانی تاوانەکەدا بەکارهێنراون و ئەو زیانانەی کە بەسەری تاوان لێکراو و کۆمەڵگای هاتووە لە ئەنجامی ئەو تاوانەی کە ئەنجامدراوە و

ش. س. م.

١- د. أيسر أنور علي و د آمال عثمان، أصول علم الإجرام والعقاب، ج ١، علم العقاب، دار النهضة العربية، ٢٩٦-١٩٩٣،٢٩٥.

٢- د. نظام توفيق المجالي، مصدر سابق ص٤٣١

پاڵنەرەکانی ئەنجامدانی)[1]، گرنگترین رووخسارەکانی تاکرەوکردنی سزایی لە تاوانی سواڵکردندا دەبینرێت، کە ئەویش ئەو رەوشەیە کە سواڵکەرەکە تێیدا دەژێت. لێرەدا لە دوو لقدا تویژینەوە لەم بابەتە دەکەین: یەکەمیان تەرخان دەکەین بۆ بارودۆخی توند بە گشتی، و لە دووەمدا باس بارودۆخی توندی تایبەت دەکەین، کە یاسادانەر لە تاوانی سواڵکردندا روونی کردەوە، ئێمەش یەک لە دوای یەک باسی ئەوە دەکەین.

## لقی یەکەم
## بارودۆخە توندە گشتییەکان

پێش ئەوەی باس لە پێناسەی بارودۆخی توندی گشتی بکەین، پێویستە پێناسەی بارودۆخی توند بکەین، کە رێگە بە دادوەر دەدات قورسترین سزای بۆ تاوان دیاری بکات، کە یاسادانەر بە یاسا رێکیخستووە، یان رێگە بدات بە گۆڕینی سزاکە بە زیادکردنی سزایەکی توندتر. لەوانەیە لە هەندێک حاڵەتدا رێگەپێدراو بێت سزا توند بکات و لە حاڵەتەکانی تردا ناچاربێت بە توندی سزاکە دەربکات، بەو پێیەی یاسادانەر دەسەڵاتی هەڵسەنگاندنی بە دادوەر داوە، کە گونجان بکات لە نێوان ئەو سزایەی کە بۆ تاوانەکە بڕیاری لەسەر دەدات لەگەڵ ئەو بارودۆخە توندانەی، کە دەوری تاوانبارەکەی داوە، بۆ رووبەڕووبوونەوەی مەترسی تاوانکاریی[2]، زۆربەی یاساکان بارودۆخی توند رێکدەخەن بەو دوو ئاراستە رێگا بگرنەبەر: یان لە بەشی گشتیدا سزاکە دیاریی دەکات بەجۆرێک کە هەموو تاوانەکان

ش. س. م.

١- د علي حسين خلف .ود. سلطان الشاوي, مصدر سابق ص٤٤٣

٢- د. محمد عبد اللطيف، مصدر سابق ص١٨٤.

دەگــرێتەوە و پێــی دەوترێــت بــارودۆخی تونــد بە گشــتی، یــان لە بـابەتگەلێکی جیـادا لە بەشـی تایبەتـدا دیـاری دەکـات و پێـی دەوترێت بــارودۆخی تونــدی تــایبەت[1]، لێــرە بەدواوە لەم بەشــەدا بــاس لە بارودۆخەکــان دەکەیــن، کە بەم شــێوەیە پێناســـە دەکــرێ: (ئەو بارودۆخانەن، کە یاسا دیارییان کردوون، کە بەسـەر هەمـوو تاوانەکان جێبەجێ دەبێت[2]. بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەری عێراق بارودۆخی تونــدی لە یاســای ســزادانی عێراقــی ژمــارە ١١١ی ســاڵی ١٩٦٩، هەمـوارکراوی دا دیـاریکردووە[3]. بۆیە ئێمە بـاس لە دووبـارەبوونەوەی تــاوان دەکەیــن وەک بــارودۆخێکی ســەختی گشــتی و ئەگەری جێبەجێکردنـی بـۆ تـاوانی سـواڵکردن یـان نەکـردن، دووبـارەکردنەوەی تـاوان بـریتییە لەوەی: ( ئەوکەسـەیە دوای ئەوەی لە تاوانێـک حـوکمی دراوە، تاوانێــک یــان چەنــد تــاوانێکی دیــکەش ئەنجــام دەدات)[4]، دووبــارەکردنەوەی تـاوان بـریتییە لە حاڵەتێـک یـان تایبەتمەنـدییەکی کەســی تاوانبــارە، کە لە بـارودۆخێکی ســەختی کەســییدایە، جارێــک بەتەواوی سزادراوە، لە تاوانێکی پێشوودا و دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجامدانی تاوانێکی نوێ. دووبـارەبوونەوەی تەنها ئەو کەسـانە دەگرێتەوە کە ئەو حاڵەت و سیفەتانەیان تێیدایە، جا ئەو کەس تاوانباری تاوانەکە بێت یان هاوبەشی تاوانەکە بێت، کاریگەرییەکەی بۆ ئەوانی دیکە درێژنـابێتەوە، کە ڕەنــگە بەشــدارییان لە تــاوانەکەدا کردبێــت. هەروەهــا مەرجــی دووبارەبوونەوە ئەوەیە کە دەبێت سزایەکی تاوانکاری بۆ دەرچووبێ،

ش. س. م.

١- د. عبد الحميد الشواربي، مصدر سابق ص١٠١.

٢- د. علي حسين الخلف ود. سلطان الشاوي، المصدر السابق, ص٤٤٥.

٣- المادة ١٣٥ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل .

٤- د فخري عبد الرزاق الحديثي مصدر سابق.

ئەو حوكمانەی كە دەرهەق بە منالْ دەرچووە، لەبابەتی كەتن و تاوان، رێوشوێنی دووبارەبوونەوە نایانگرێتەوە.

لەكاتێكدا یاسادانەری عێراق باسی لە بڕگەكانی دووبارەبوونەوەی تاوانی لە سوالْكردندا نەكردووە، ئەوەشی بۆ بڕگە گشتیەكانی یاسای سزادان جێهێشتووە، لەوێ مەرجی دووبارەبوونەوەی بە دەرچوونی حوكمێك لە كەتێنێك یان تاوانێك گرێدا، دەرهەق بە پێشێلكارییەك دەرچووە كە پێشینە لە دووبارەبوونەوە نەبێت[1]، بەو پێیەی تاوانی سوالْكردن بەپێی بڕگەكانی مادەی ٣٩٠ی یاسای سزادان بە سەرپێچی دادەنرێت، بۆیە بڕگەكانی دووبارەبوونەوەی بەسەردا ناسەپێت جگە لە حالەتەكانی ڕاكێشانی خەلْك بۆ سوالْكردن، واتا بكەری مەعنەوی[2]، لە ئەگەری بەردەستبوونی بارودۆخی توند، كە لە مادەی ١/٣٩٠ی یاسای سزادان‌دا هاتووە، بەلاّم بڕیارێك لەلایەن ئەنجومەنی سەركردایەتی هەلْوەشاوەی شۆڕشگێڕی لە سالْی ٣٠-١-٢٠٠١ دەرچووە، داوا دەكات لە سەرجەم مەفرەزەكانی پۆلیس دەكات، سوالْكەرانی گەڕاوە دەستگیر بكەن، بەپێی دەقی بڕیارەكە، كە بریتییە لە ڕاگرتنی سوالْكەران بۆ ماوەی سالێك لە دەرەوەی پارێزگا، ئەوانەی كە پێشتر حوكمی دادگایان لەسەرە و بۆ كاری سوالْكەریش دەگەڕێنەوە[3]. بۆیە داوا دەكەین لە دەسەلاّتی یاسا دانانی عێراقی و كوردستانی سزای سوالْكردن توندتر بكاتەوە، تاوانەكە بگەیەنێتە ئاستی تاوانی كەتن، دەقەكەی بكرێتە لە حالەتی گەڕانەوە بۆ سەر تاوانی سوالْكردن یان دووبارەكردنەوەی تاوانی سوالْكردن لە لایەن سوالْكەرەكەوە. هەروەها

ش. س. م.

١- سەیری: ماددەی ١٣٩ لە یاسای سزادانی عێراقی بكە.

٢- سەیری: مادەی ٣٩٢ لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی سالْی ١٩٦٩ هەمواركراوی بكە.

٣- ادم سمیان ذیاب جریمة التسول ، مصدر سابق ص١٥٠

چالاککردنی بریاری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی حزبی بەعسی هەڵوەشاوە، بۆ نەهێشتنی دیاردەی ژمارەیەکی زۆر لە سواڵکەران و بڵاوبوونەوەیان لە شار و گەرەک و شوێنە گشتییەکان بۆ پاراستنی رووخساری شارەکان و پاراستنی شعوری هاوڵاتیان و بێزار نەکردنیان، لەلایەن سواڵکەرانەوە، هەروەها بۆ پاراستنی کەرامەتی کەسی سواڵکەر و شکۆمەندییەکەی و سووکایەتی پێنەکردنی لەلایەن هاوڵاتیانەوە.

## لقی دووەم
## بارودۆخە توندە تایبەتەکان

بەم شێوەیە پێناسە کراوە: (ئەو بارودۆخانەی، کە لە تەوەری جیادا لە بەشی تایبەتی یاسای سزادان دیاری کراون، بەجۆرێک کە هەریەکەیان خۆی لە خۆیدا پەیوەستە بە تاوانێکەوە بە یاسا دیاری کراوە، یان ژمارەیەکی دیاریکراوی تاوانن، حوکمەکەی لەم تاوانە زیاتر نییە)[1]. ئەو بارودۆخانەی، کە لە یاسادا دیاری کراون، بە بارودۆخی تایبەت دادەنرێت و سیفەتی گشتگیرییان نییە، بەڵکو لە هەندێک تاواندا حاڵەتێکی تایبەتە[2]، چونکە بە تاوانێکی دیاریکراو پەیوەستە، یان لەلایەن یاسادانەرەوە دیاری کراوە[3]. بارودۆخەکان سەختەکانیش دابەش دەکرێن بەسەر بارودۆخی ماددی توند و بارودۆخی کەسی، ئەوەی باسی دەکەین رەوشە ماددییەکانی پەیوەست بە کردەوەی تاوانکارییەکەیە، لەو رێگایانەی کە لە لێکۆڵینەوەی تاوانەکەدا

ش. س. م.

١- د. عبدالحميد الشواربي مصدر سابق ص١١٦

٢- د. علي حسين خلف ود سلطان الشاوي، مصدر سابق ص١١٦

٣- د. مدحت محمد عبدالعزيز، مصدر سابق ص٤٤٦

بەکارهاتووە، یاسادانەری عێراق باسی بارودۆخی توندی تایبەتی لە تاوانی سوالکردن دەکات و دەڵێ: (سزاکەی زیندانیکردن دەبێت بۆ ماوەیەک لە ساڵێک زیاتر نەبێت، ئەگەر خۆی وەک بریندار یان کەمئەندام پیشاندا، یان هەر ئامرازێکی تری فریودان بەکاربهێنێت، تاکو وا لە خەڵک بکەن خێری پێ بکەن، یان برینداری یان لەکەیەکی خۆی بۆ سوالکردنکە بەکاربێنێت)[1]، بۆیە ئێمە باسی ئەو حاڵەتانە دەکەین، کە لەلایەن یاسادانەر یەک لە دوای یەک ناویان هێنراوە.

## یەکەم: سوالکردن لە ڕێگەی خۆ نمایشکردن وەک بریندار یان کەمئەندام

ئەم بارودۆخە توندە خۆی لە لەو ڕەوشە دەنوێنێ کە یاسادانەر دایناوە، کە برینی وا پێناسەکردووە: بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی کە شوێنەوارێک لەسەر جەستەی مرۆڤ بەجێدێڵن، چ لە دەرەوە یان ناوەوە لاشە بێت، وەک بڕینی شانەکان، داماڵینی پێست، مۆربوون، سووتانەوە، درز لە ئێسکەکاندا یان شکان)[2].

برین پچڕانی شانەکانی جەستەیە، لەوانەیە بکەوێتە ناوەوەی یان دەرەوەی لەش، لە ماسولکە و دەمار و هەناو یان لەسەر پێستە رووبدات[3]. چونکە پیشاندانی برینەکان ئامرازێکی کاریگەرە بۆ فریودانی خەڵک و بەدەستهێنانی سۆز و بە زەییان.

---
ش. س. م.

١- ينظر: المادة ٣٩٠/١ من قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل.

٢- عبد الخالق النواوي، جرائم الجرح والضرب في الشريعة الإسلامية والقانون الوضعي، منشورات المكتبة العصرية، بيروت، ص٧.

٣- د وصفي محمد علي الوجيز في الطب العدلي، العاتك لصناعة الكتب، القاهرة، ٢٠١٠، ص ٤٦.

یاســادانەری عێــراقیش ئەم مــۆدێلەی وەک هەلــومەرجێکی تونــد ناساند بۆ وەستاندنی کەیسەکانی ساختەکاری و شـێوازی فێڵکردن، کە هەنـدێک لە سـواڵکەرەکان ئەنجـامی دەدەن، وەک ئەو سـزای بـۆ دانـاو گوتی: (سـزاکەی زینـدانیکردن دەبێت بۆ مـاوەیەک کە لە سـاڵێک زیـاتر نەبێــت ئەگەر ســواڵکەر خــۆی وەک برینــداربووێک نمــایش کــرد)[١]. یاسادانەر هەر بەوەندە نەوەستا، بەڵکو کەمئەندامیشی بۆ زیادی کرد و وا پێناسەی کەمئەندامی کرد: (کەمئەندامی واتا لەدەستدانی یەکجـارەکی، تەواوی یـان بەشـێکی جەسـتە، جـا چ بە بڕینـی ئەم بەشـە بێت، یـان بە جیـاکردنەوەی، یــان لەکارخســتنی ئەرکەکەی بێــت)[٢]. هەنــدێکی تــر بەم شـێوەیە پێناسـەیان کـردووە: (لەدەسـتدان یـان لەکـارکەوتنی ئەنـدامێکی جەستە یان یەکێک لە هەستەکانی، یان شێواندنی)[٣].

کەمئەندامی دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی هێزی یەکێک لە ئەندامەکان یـان کەمبـوونەوەی بەرگـرییەکەی. یـان کە دەبێـتە هـۆی کەمبـوونەوەی هێــزی یەکێــک لە بەشــەکانی جەســتە یــان کەمبــوونەوەی بەرگــرییە سروشتییەکەی[٤]. بۆیە بۆمان دەردەکەوێت، کە زۆر لە سـواڵکەرەکان وا خۆیان نیشـان دەدەن، کە کەمئەنـدامن. هەیـانە وا خـۆی نیشـان دەدا، کە ئیفلیج بووە، یان نـاتوانێ لەسـەر قاچەکانی بوەستێت، بـۆیە کۆچـان بـۆ ڕۆیشــتن بەکــاردێنێ، دواتــر کە ئەمە پشتڕاســت دەکــرێتەوە، بۆمــان دەردەکەوێـت، کە ئەوانە بەدەسـت شـتێکەوە نانـاڵێنێـت. یاســادانەری عێراقی سزای ئەو سواڵکەرانەی کەوا خۆیان بە بریندار یان کەمئەندام

ش. س. م.

١- د. حسني مصطفى, مصدر سابق ص٢٠.

٢- المادة ٣٩٠ / ١ قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

٣- د . حسني مصطفى المصدر السابق ص ١٦.

٤- د. عبد الرحمن توفيق احمد, شرح قانون العقوبات القسم الخاص, الجرائم الواقعة على الأشخاص ط١ دار الثقافة والنشر والتوزيع بدون مكان طبع ٢٠١٢ ص ٣٥

پیشـان دەدەن بە زینـدانیکردن بـۆ مـاوەی سـاڵێک زیـاتر نەبێت، ئەگەر برینەکە بەهـۆی کەمئەندامییەوە بێت[1]، هەروەهـا یاسـادانەری عێراقیش، بە بۆچوونی ئێمە، سەرکەوتوو بوو لە سنووردارکردنی ئەو دیاردەیەی، کە هەستی هاووڵاتیان ئازار دەدات، لە لایەک لەکاتی بینینی سواڵکەرانی خاوەن ئەم کەمئەندام و لە لایەکی ترەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی فێڵ و سـاختەکاریەکەیان، کە ئامـاژەن بـۆ مەترسـییەکی تاوانکـاری، کە لەنـاو کۆمەڵگا بڵاوبۆتەوە.

## دووەم: سـوالکردن بە بەکارهێنـانی ئـامرازێکی فریـودان یـان خەڵەتاندن

فریـودان کردەوەیەکـی ئەرێنیـیە، کە لە ڕەفتـارێکی درۆیـنەدا بەرجەستە دەبێ، کە ئەنجامدەرەکە وا لە تـاوان لێکراو دەکات بکەوێتە هەڵە، ئەم هەڵەیەش بە بنەمـا دادەنرێت بۆ پاڵنـانی تـاوان لێکراوەکە بۆ ئەوەی پـارەکە ڕادەسـتی تاوانبـارەکە بکـات، خەڵەتانـدن لەسـەر درۆ وەسـتاوە[2]. درۆش جەوهەری ئەو فیتـنەیە کە ئامانجیـان فریـودانی قوربـانییەکەیە، درۆ هەر شـێوەیەکی هەبێـت هەر درۆیە، بەو پێـیەی ڕاستی دەشێوێنێت، جیاوازی نییە لە نێوان بانگەشەی بوونی ڕووداوێک بکرێت، کە بوونی نییە، یان بە پێچەوانەوە، هەروەهـا جیاوازی نییە لە نێوان درۆکردنەکی کەم و درۆیەکی زۆر، وەک چۆن فێڵکردن ئامـانجی گۆڕینی ڕاستییە بە شێوەیەک کە ببێتە هـۆی خەڵەتانـدنی قوربـانییەکە، وەک چـۆن سـواڵکەرەکە درۆ دەکـات و ڕووداوەکە بە شـێوەیەک وێنـا

---

ش. س. م.

١- المادة ٣٩٠/١ قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل.

٢- د.فخري عبد الرزاق الحديثي د. خالد حميدي الزغبي شرح قانون العقوبات القسم الخاص الجرائم الواقعة .على الاموال دار الثقافة والنشر والتوزيع ٢٠٠٩ص١٢٤

دەکات، کە ڕاست نییە، ئەمەش پەشێوییەک لە کەسەکەدا دروست دەکات کە وا دەکات باوەڕ بە شتێکی جیاواز لە ڕاستی بکات[1].

پێوەر لە وەسفکردنی هەر وتەیەک یان نووسینێکی درۆ ئەوەیە، کە تا چەند هاوتایە لەگەڵ حەقیقەتی بابەتیی، بەبێ هیچ ڕەچاوکردنی قەناعەتی کەسی[2]، بەم پێیە دەبینین زۆرێک لە سواڵکەرەکان بە ڕێگەی جیاواز و شێوازی جیاواز، کە لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دیکە جیاوازە خەڵک فریو دەدەن، بەلاّم کەسێک کە بۆ ڕزق و ڕۆزی خۆی سواڵ بکات و خەڵک بخەڵەتێنێت، ئێمەش بە پێچەوانەوە ئەمە دەبینین کە باری گوزەران و دارایی زۆر باشە، ئەوا پێویستی جوانکاری دەکرێت، کە پێچەوانەی شەریعەتە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی، کە ئەو یەکێک نییە لەو کەسانەی کە ڕزق و ڕۆزی ڕۆژانەی خۆی نییە. هەندێکیان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە تووشی کەمئەندامییەک بوونە بە گۆچان ڕێ دەکەن، لە ڕاستیدا بە پێچەوانەوە دەردەچێ، زۆر فێڵ لە سواڵکردن هەیە، هەیانە خوی وەک ناسیاوێک پیشان دەدات، گوایە سواڵکەر نییە، پارەی لێ براوە، پێویستی بە کەمێک پارە هەیە[3]، خەڵەتاندن باوەڕهێنانە بە شتێکی ناراستی، هەروەها هەندێجار سواڵکەرە پروپاگەندەی ئەوە دەکات، کە فولانە کەس دەناسێ و ناوی دێنێ، ئەو کەسەش کەسایەتیەکی دیاری کۆمەڵگایە، بە رووکارێکی ڕێک خۆی نمایش دەکات، کە ئەو سواڵکەر نیە، تەنها پێویستی بە برێک پارە هەیە، بۆیە هەڵخەڵەتاندن ڕەواجدانە بە بیروباوەرێکی ناراست

---
ش. س. م.

١- نصر شومان، جريمة الاحتيال ، مصدر سابق ص٣٠-٣٢.

٢- د.فخري عبد الرزاق الحديثي د. خالد حميدي الزغبي شرح قانون العقوبات القسم الخاص الجرائم الواقعة .مصدر سابق ص١٢٧

٣- عبدالله بن مشيب بن عبادي القحطاني – السياسة الجنائية لمكافحة التسول – مصدر سابق ص٤٨

بەلام یاسادانەری عێراقی مەرجی ئەوەی دانا کە بەکارهێنانی هەر ئامرازێکی فریودان بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خەڵک بە بارودۆخێکی توند دانا، کە پێویست دەکات سزای بە زیندانیکردن بۆ ماوەیەک کە لە ساڵێک زیاتر نەبێت[1]، بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەری عێراق لە کێشەی ئەو جۆرە سواڵکەرانەدا سەرکەوتوو بووە، چونکە ڕادەی مەترسییە تاوانکارییەکانیان ئاشکرا دەکات، کە لەلایەن سواڵکەرانەوە بەکاردێت، لەگەڵ ئەو ڕێگا پێشکەوتووانەی هەڵخەڵەتاندن کە بەکاریدێنن.

**سێیەم: سواڵکردن بە دەرخستنی برینێک یان کەمئەندامییەک**

ئاشکراکردن لێرەدا واتە نیشاندانی برینێک یان کەمئەندامییەک وەک نموونەیەک بۆ توندکردنی سزای سواڵکردن دێت، برین بریتییە لە (هەموو برینێک لە جەستە یان دڕان لە شانەکاندا کە لە ئەنجامی بەکارهێنانی ئامێرێکی تیژەوە دروست دەبێت، ئەمە رووشان و داماڵین و شکان و سوتان خوێن بەربوونی ناوەوەش دەگرێتەوە)[2]، کەواتە هەر دەرکەوتنێکی ئەم بەشانە لە جەستەدا بە بارودۆخێکی قورس دادەنرێت.

هەڵوێستی یاسادانەری عێراق بەدەرخستنی برینی بە بارودۆخێکی توند داناوە، کە پێویستی بە سزای توند هەیە، بەپێی بڕگەکانی ماددەی ١/٣٩٠ی سزای عێراقی یاسای ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩، هەموارکراوە، کە دەڵێت: (سواڵکەر سزا دەدرێت بە زیندانیکردن بۆ ماوەی ساڵێک زیاتر نەبێت. بۆمان دەردەکەوێت کە ئاشکراکردنی برین، هەستی هاوولاتیان ئازار دەدات و دەیانخاتە بەردەم هەراسانکردن و ئازاری دەروونی و هەستیان بریندار دەدات، بۆیە ئامانجی یاسادانەر

ش. س. م.

١- المادة ٣٩٠/١ قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

٢- د. وصفى محمد على، مصدر السابق، ص١٢٥.

چڕكـــردنەوەی ســـزایە بەســـەر ســـواڵكەر، ئەگەر لە ســـەر بنەمـــای خەمخۆری كەمئەندام و برینـدارەوە بێت، ئەو سـواڵكەرەی كە بەدەست ئەو بـرین یـان ســووتانەوە دەناڵێنێـت، بـۆیە نابێـت هـیچ تونـدییەك بەرامبەری هەبێت، چونكە ئەو بەراستی تووشی ئەم نەخۆشییە بووە، نەخۆشـــییەكەی هەڵبەســـتراوی نەبێـت، ســـەبارەت بە ئاشـــكراكردنی كەمئەنـدامییەكەش، ئەمە بـوو بە نمـوونەی تەواوكەر بـۆ ئاشـكراكردنی بـــرینەكە، وەك بـــارودۆخێكی تونـــد و كەمئەنـــدامییەكەی، وەك پێشـــتر باسـمانكرد، بەڵام سـواڵكەرەكە سـوود لە نەبـوونی ئەندامێكی جەسـتەی دەبینێ، بۆیە شایسـتەی سـزای تونـد دەبێتەوە[1]. لەكاتێكدا یاسـادانەری عێـراق ئەو كەیســـانەی ڕوونكـــردەوە و ئەوانەی فـــۆڕمی كەمئەنـــدامی هەمیشـــەیی تێیـــدا دەردەكەوێـــت، كە دادگـــای تایبەتمەنـــد پشـــتی

ش. س. م.

١- عبدالخالق النواوي، مصدر سابق، ص٢٧.

پێدەبەستێت[1]، هەروەها بڕیاری دادگای تەمیزی عێراقیش هەیە، کە حاڵەتی شێواندی جەستە بەهۆی کەمئەندامی[2].

یاسادانەری عێراق بەڕوونی ڕایگەیاندووە کە ئاشکراکردنی ئەو لاوازییە بارودۆخێکی توندە لە تاوانی سواڵکردندا و سزاکەی زیندانیکردنە بۆ ماوەیەک کە لە ساڵێک زیاتر نەبێت[3]. بۆمان دەردەکەوێت کە ئاشکراکردنی کەمئەندامی پێویستی بە ئامێزگرتنی کەمئەندام هەیە و ڕادەستکردنی بە یەکێک لە خانەکانی سەرپەرشتی کە لەلایەن دەوڵەتەوە بەڕێوەدەبرێن، بە مەبەستی چارەسەرکردن و

ش. س. م.

١- د. حسين عبد الصاحب عبدالكريم جرائم الاعتداء على حق الانسان في التكامل الجسدي, المصدر السابق ص١٣٢. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مادەی ٤١٢ی یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراو، کە دەڵێت: هەرکەسێک بە ئەنقەست دەستدرێژی بکاتە سەر کەسێکی دیکە بە بریندارکردن، لێدان، یان توندوتیژی، یان بە پێدانی مادەیەکی زیانبەخش، یان بە ئەنجامدانی هەر کارێکی دیکە، کە سەرپێچی یاسا بێت و بە مەبەستی ببێتە هۆی کەمئەندامی هەمیشەیی، سزا دەدرێت بە زیندانیکردن بۆ ماوەیەک کە لە پانزە ساڵ زیاتر نەبێت. کەمئەندامی هەمیشەیی کردەوەکە دەبێتە هۆی بڕین یان جیاکردنەوەی ئەندامێکی جەستە بڕینی بەشێکی جەستەی، لەدەستدان یان کەمی سوودێک، شێتی، تێکچوونی دەروونی، کەمئەندامی هەمیشەیی تەواو یان بەشەکی یەکێک لە هەستەکان، شێواوییەکی گەورە، کە هیوای بۆ ناخوازرێت، یان مەترسییەکی دەستبەجێ بۆ سەر ژیان.

٢- ينظر قرار محكمة التميز العراقية المرقم ١٦٧٨ في ١٢/٢/١٩٨٥

٣- بڕوانە بەشی دووەمی ماددەی ٣٩٠ی یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراوی عێراق کە تێیدا هاتووە: (سزاکە دەبێتە زیندانیکردن بۆ ماوەی ساڵێک زیاتر نەبێت ئەگەر سواڵکەرەکە تووشی بریندارى یان کەمئەندامی بوو، یان هەر ئامرازێکی فێڵکردن بەکاربهێنێت بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خەڵک، یان کەمئەندامی یان برینداربوونێک ئاشکرا بکات." لە سواڵکردندا).

پـارێزی، بـۆ پاراسـتنی خـودی سـواڵکەرە، بەو پێـیەی نمایشـکردنی کەمئەندامییەکە لە دەستی ئەودا نییە، وەک زۆربەیان کەمئەندامیەکەیان بە دەرەوەیە و بەرچـاون، وەک شـێتی، ئیفلیجـی، کوێریی، بـاڵا کـورتی، یـان شـێواوی زگمـاکی، بـۆیە لە دەسـتی سـواڵکەردا نیـیە ئەو کەمئەنـدامییەی بشـارێتەوە. ئەگەرچـی ببێـتە هـۆی ئـازاردانی هەسـتی هاوڵاتی یان تێکدانی سەلیقەی گشتی، ئەمەش وایکرد یاسادانەر جەخت لەسـەر پاراستنی بەرژەوەنـدی هـاوڵاتی و کەرامەتـی کەمئەنـدامان یـان خـاوەن پێداویسـتی تـایبەت بکـاتەوە، ئـێمە پێمـان وایە، باشـترە ئەگەر یاسادانەر دەقی مـادەی ١/٣٩٠ هەمـوار بکـاتەوە و ئەم وێنەیە لابەرێت، جگە لەو کەمئەندامییەی کە بەدرێژایی ژیـانی هـاوڕێیەتی، بـا یاسـادانەر نەبێتە بارگرانی بەسەر کەسی کەمئەندام، لە لایەکی دیکەوە یاسـادانەر لە یاسـای (چـاودێریکردنی خـاوەن پێداویسـتییە تایبەتەکـان و کەمئەنـدامانی ژمـارە ٣٨ی سـاڵی ٢٠١٣ ) مـامەڵەی لەگەڵ کەمئەنـدام و کەسێکی خاوەن پێداویستی تایبەت کردووە، بەو پێیەی کەسـی خـاوەن پێداویستی تـایبەت (هەمـوو ئەو کەسـەیە کە بە تەواوی یـان بەشـێکی لە توانـای بەشـداریکردن لە ژیـانی کۆمەڵگـادا وەک ئەوانـی دیـکە بەهـۆی کەمئەنـدامی جەستەییەوە لەدەسـتداوە، لە ئەنجـامی تووشـی بـوونی بە کەمئەنـدامییەکی جەسـتەیی یـان زیهنـی یـان هەسـتی ، کەوای لێکـردوە راپەرانـدنی کارەکـان کەموکـوری هەبێـت)[1]. سـەبارەت بەو کەسـەی کە خـاوەن پێداویسـتی تـایبەتە ئەوا: (ئەو کەسـەیە کە کەموکـوڕی هەیە لە ئەنجامـدانی ڕۆڵ و ئەرکەکـانی لە پێوەنـدی لەگەڵ هاوتەمەنەکـانی لە لە ژیـنگەی کـۆمەڵایەتی، ئـابووری و پزیشـکی، پەروەردەیـی، وەرزش، ڕاهێنـانی پیشـەیی، پەیوەنـدی خێزانیـی و تـاد، و بـاڵا کـورتی بە یەکێـک

ش. س. م.

١- المادة ١ ثانيا من قانون رعاية ذوي الإعاقة والاحتياجات الخاصة رقم ٣٨ لسنة ٢٠١٣ .

لەوانە دادەنرێت کە پێویستی تایبەتیان هەیە)[1]. ئەم یاسایە دەرچووە بە مەبەستی دەستەبەرکردنی ژیانێکی شایستە بۆیان و تێکەڵکردنیان لەگەڵ کۆمەڵگادا، یاسادانەریش لە مادەی ٢٢ی یاسای چاودێریکردنی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان و کەمئەندامانی ژمارە ٣٨ی ساڵی ٢٠١٣دا ئاماژەی بەوە کردووە، کە سزای زیندانیکردنە بۆ ماوەیەک لە ٦ مانگ زیاتر نەبێت یان غەرامەکردن کە لە (٥٠٠،٠٠٠) پێنج سەد هەزار کەمتر نەبێت و لە لە (١،٠٠٠،٠٠٠) ملیۆن دینار زیاتر نەبێت، هەرکەسێکی کەمئەندامی یان خاوەن پێداویستی تایبەت کەمئەندامی یان زگماکی خۆی وەک ئامرازێک بۆ سواڵکردن قۆستۆتەوە)، بەم شێوەیە بۆیان دەردەکەوێت کە ئیستغلالکردنی کەمئەندامییەکە خۆی بە مەبەستی سواڵکردن لێ قەدەغە دەکات، ئەمەش پێویستە دەسەڵاتی دادوەری ئەم بابەتە لەبەرچاو بگرێت بۆ ئەوەی کەرامەتی کەمئەندامان بپارێزێت و زەوقی گشتیش بپارێزێت.

**چوارەم: پێداگری لە داواکردن**

پێداگری لە سواڵکردن، واتا بە توندی داواکاری شتێک بکەی، بەو پێیەی سروشتی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان و سواڵکەرەکان پەیوەندییەکی هاوسۆزییە لە رێگەی نیازی بەخشینی خێرەوە دەبێت، سواڵکەرانیش لە بۆنە ئاینییەکاندا زۆرن و ئامرازەکانی پێداگری لە داواکردن و لەبەرکردنی جلوبەرگی کۆن وشڕ و وڕ کە مەبەست لێی وروژاندنی سۆزی خەڵکە، سەرەڕای قەدەغەکردنی سواڵکردن، بەڵام تێڕوانینی خەڵک بۆ سواڵکردن بەو توندییە نییە، کە لە یاساکەدا

ش. س. م.

---

١- سەیری : المادة ١/ سابعا من قانون رعاية ذوي الإعاقة والاحتياجات الخاصة رقم ٣٨ لسنة ٢٠١٣.

هـاتووه[1]، حـاڵەتی منجـڕی لە سـواڵکردندا هەیە، هەنـدێکجار گریـانی لەگەڵـدایە، ئەو کەسـە بانگەشـەی ئەوە دەکـات، کە خێزانێکـی هەیە، ناتونێت بەخێویـان بکات[2]، کەسانێک هەن کە ئەو کـاڵا و کەرەستە بۆ بایەخـانەی کە سـواڵکەر پێشکەشـیان دەکـات بە بیـانووی فرۆشـتن لە پێشـانگای ئۆتۆمبێل لە ڕێگەی پێداگری لەسـەر کەسـەکە بە مەبەسـتی کڕینی یان سواری پاس دەبێت و بانگەشەی ئەوە دەکات، کە ئەندامێکی خێـزانەکەی پێویسـتی بە ئەنجامـدانی نەشـتەرگەری هەیە و پێـداگری لەسەر ئامادەبووان دەکات، بە مەبەستی یارمەتیدانی[3]، هەربۆیە بۆمـان دەردەکەوێـت کە شـێوازەکانی سـواڵکردن پەرەی سـەندووە و سـواڵکەرەکە داهێنـانی لە چەنـد ڕێگەیەکـی سـواڵکردندا کـردووە، بـۆ دڵنیـابوون لە دەستڕاگەیشـتن بە پـارە، هەندێجار بەڵگەنـامەی پزیشـکی سـاختەی دەخـاتەڕوو یـان پێـداگری لەسـەر سـواڵکردن بە مەبەسـتی وروژاندنی سۆزی خەڵک دەکات[4]. یاسادانەری عێراق لە بەشی دووەمی ماددەی ۳۹۰/۱ی یاسـای سزادانی عێراقی ژمـارە ۱۱۱ی سـاڵی ۱۹۶۹دا هەمـووارکراو، وەک بـارودۆخێکی تونـد، مـامەڵەی لەگەڵ ئەم وێـنەیەدا کردووە[5]. کاتێک یاسادانەر پێداگری لە سواڵکردندا دەکاتە بارودۆخێکی تونـد، ئەوە ئامـاژەیە بـۆ ئەو هەراسـانکردنەی کە سـواڵکەر بـۆ خەڵکـی گشتی دروستی دەکات و ئازاری هەستی هاووڵاتیان دەدات و سەلیقەی

ش. س. م.

١- د ابتسام علام الجماعات الهامشية دراسة انثروبولوجية لجماعات المتسولين في مدينة القاهرة, مصدر سابق ص ٢٩

٢- عبدالله بن مشيب بن عبادي القحطاني، مصدر سابق ص٤٨

٣- د ابتسام علام المصدر السابق ص ٨٣.

٤- على الشرفات، ظاهره التسول حكمها وأثارها في الفقه الإسلامي مصدر سابق ص٦٣

٥- سەیری مادەی ١/٣٩٠ لە یاسای سزادانی عێراقی سالی ١٩٦٩ بکە.

گشــتی دەشــێوێنێ، بەڵام ئــێمە ئەو ســووبونەی ســوالکەر وەک بارودۆخێکی توند دەبینین، کە پێویستی بە سزای توندیش هەیە، لە تاوانی سوالکردندا سەلماندنی ئەستەمە، ئەمە لە لایەک و لە لایەکی ترەوە، هیچ کۆنترۆڵ و پێوەرێک نییە بۆ ئەوەی بزانرێت تا چەند پێداگری لەلایەن سوالکەرەوە کراوە، بۆیە هیچ بڕیارێکی دادوەریمان نەدۆزیەوە کە بەهۆی کروزانەوە جەخت بکاتەوە لەسەر سزای سوالکەر، بۆیە هیوادارین یاسادانەر ئەم بارودۆخە لاببات و تەنها بارودۆخی خۆنمایشکردن بە بریندار یان کەمئەندامی بهێڵێتەوە وەک بەکارهێنانی فێڵ یان هەر ئامرازێکی دیکە.

# بەشی سێیەم
# ئامرازەکانی چارەسەرکردنی تاوانی سواڵکردن

لەم بەشەدا باسی گرنگترین ئەو ئامرازانە دەکەین، کە بەهۆیەوە چارەسەری تاوانی سواڵکردن دەکات، هەروەها بەهۆیەوە ئەم دیاردەیە لە کۆمەڵگا بنبڕ دەبێت، کە دیاردەیەکی خراپ و بڵاوە لە زۆربەی وڵاتانی جیهان، بەهۆی ئەوەی شوێنەواری ترسناک لەسەر گەشەی زیهنی تاک جێدێڵێت، چونکە سواڵکردن بە پێشێلکردنی ئازادی تاک و پێشێلکردنی مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ دادەنرێت[1]. هەموو ئەمانە وای لە وڵاتان کرد، کە لە ڕێکەوتنی دەوڵەتەکان و دەستورەکانیان زۆر دەق یاسایی دەبینین، کە چارەسەری ئەم دیاردەیە بکات. بۆیە ئەم بەشە دابەش دەکەین بۆ دوو تەوەر: تەوەری یەکەم تەرخان دەکەین بۆ ئامرازەکانی چارەسەرکردنی نێودەوڵەتی، دووەمیش تەرخان دەکەین بۆ ئامرازەکانی چارەسەرکردن لە یاسا ناوخۆ و وەزارەتە پەیوەندیدارەکان، بەم شێوەیەی خوارەوە:

ش. س. م.

---

١- منال فتحي عنبتاوي، تقييم برنامج مكافحة ظاهرة التسول من قبل وزارة التنمية الاجتماعية الاردنية خلال فترة من ١٩٩٦ لغاية ٢٠٠١، رسالة ماجستير في علم الاجتماع كلية دراسات الجامعة الادرنية، ٢٠٠٤، ص٢.

# باسی یەکەم
# ئامرازەکانی چارەسەری تاوانی سواڵکردن
# لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی

ئامرازەکانی چارەسەری ئەم دیاردەیە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، کە ئامانج لێی پاراستنی کەرامەت مرۆڤ و مافەکانیەتی، لە زۆربەی دەستوری وڵاتان ڕێککەوتنی نێودەوڵەتی کراوە، بۆ جێکردنەوەی چارەسەری ئەم دیاردەیە، لەم تەوەرەدا بەدوو لق باسی چارەسەریەکان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و لەسەر ئاستی نیشتمانی دەکەین، لە دەستوری عێراقی ساڵی ٢٠٠٥، گرنگترین ئەو دەقانە تاوتوێ دەکەین، کە باس لە پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ دەکات، لە دووەم لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی باسی ئامرازەکانی ئەو چارەسەریانە دەکەین کە لەمیانەی پەیماننامە و ڕێککەوتنامەی نێودەوڵەتییەکان هاتوون.

## لقی یەکەم
## ئامرازەکانی چارەسەری تاوانی سواڵکردن
## لە دەستورەکان

دوای ئەوەی پێشتر بۆ ماوەیەکی دوور درێژ دیموکراسیەت تەنها لە دەستوری وڵاتانی ڕۆژاوای هەبوو، ئەمڕۆ زۆربەی دەستوری وڵاتانی عەرەبی بە دەستوری عێراقیشەوە دان بە دیموکراسی دەنێ و دەیناسێ، دەبینین کە ئامرازەکانی ئەو پرەنسیپانەی دیموکراسی لە

ولاتێک بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە[1]. دەستوور ئەو بەڵگەنامەیە بالایەیە لە دەوڵەتدا و بە چوارچێوەی گشتی دادەنرێت، کە کاری دەسەلات لە دەوڵەتدا ڕێکدەخات و ماف و ئەرکەکان دەستەبەر دەکات، هەروەها بەڵگەنامەی دەستووریش سەرچاوەی یەکەمی یاساییە دانانە، هەرچەندە تاکە سەرچاوە نییە[2]. دەستوور بەم شێوەیە پێناسەی کراوە: (کۆمەڵێک ڕێسای پەیوەندیدارە بە ڕوونکردنەوەی سەرچاوەی دەسەلات و ڕێکخستنی پیادەکردن و گواستنەوەی دەسەلات و پەیوەندی نێوان دەسەلاتدارەکانە، هەروەها دەستور ماف و ئازادییە گشتییەکان دەستەبەردەکات، ئایا ئەو ڕێسایانە لەناو بەڵگەنامەی دەستوور هەبن یان لە یان دەرەوەی هەبن)[3]، وەک دەستوور چەندین بنەمای لەخۆگرتووە کە پەیوەندییان بە مافە مەدەنی و سیاسییەکانی هاووڵاتیانەوە هەیە، کە پەیوەندییەکی نزیکی بە پرسی پاراستن و دەستەبەرکردنی مافەکانی و دابینکردنی ئامرازەکانی ژیانەوە هەیە، باسی ئەم ماددانە وەکو ئەوەی کە بابەتی توێژینەوەیە پێویست دەکات باسی بکەین.

هەرچی یاسادانەری عێراقییە وایکردووە، گرنگیدان و بە هەند وەرگرتنی مافی مرۆڤ ببێتە بابەتێکی بنەڕەتی، بۆیە ژمارەیەک دەقی دەستوری بۆ دارشتووە، کە ئەو مافانەی لەخۆگرتووە، لەوانە:

ش. س. م.

١- د.نعمان عطا الله الهيتي - الرقابة على الحكومة دراسة دستورية مقارنة - الطبعة الأولى دار رسلان للطباعة والنشر .سوريا- دمشق - ٢٠٠٧- ص٥.

٢- د. محمد عبد الحميد أبو زيد، سيادة الدستور وضمان تطبيقه - دار النهضة العربية القاهرة ١٩٨٩ ص٤٠.

٣- د.احسان المفرجي ود.كطرن زغير وحد رعد ناجي النظرية العامة في القانون الدستوري والنظام الدستوري في العراق ط٤ شركة العاتک للنشر - ٢٠١١- ص١٦١.

(دەستەبەرکردنی هەڵ، مافێکی پارێزراوەی هەموو هاولاتیانی عێراقیە، دەوڵەت دەستەبەری هەموو ڕێوشوێنێک دەکات بۆ ئەوەی ئەمە بێتەدی)[1]. ئەم دەقە بە دەقێکی گرنگ بۆ سنووردارکردنی دیاردەی سواڵکردن لە عێراق دادەنرێت، وەک پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، لە کۆی ئەو هۆکارانەی کە بەشداری لە بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە دەکەن، بڵاوبوونەوەی بێکاری و نەبوونی هەلی کارکردن، بێکاریش سەر بۆ هەژاریی دەکێشێ و دەبێتە پاڵنەرێک بۆ ڕەفتاری تاوانکاریی و پەنابردنە بە سواڵکردن[2].

بۆیە دەوڵەت پابەندە و لەسەریەتی بە دەستەبەرکردنی دەرفەتی یەکسان بۆ سنووردانان و کەمکردنەوەی دیاردەی سواڵکردن و ڕۆیشتن بەرەو تاوان، هەروەها لە دەقەکانی دەستووردا، چەند بڕگەی پەیوەست بە پابەندبوونی دەوڵەت بە دابینکردنی هەلی کارەوە دەبینین، بەو پێیەی کارکردن سەرکەوتووترین ئامرازە لە کەمکردنەوە و نەهێشتنی دیاردەی سواڵکردن، لە دەستووری عێراقدا هاتووە کە: (کارکردن مافێکە بۆ هەموو عێراقییەکان بە شێوەیەک کە گەرەنتی ژیانیان بۆ بکات)[3]. هەروەها لەناو خۆیدا دەقی دەستووری دەگرێتەوە کە دەوڵەت گەرەنتی تاک و خێزان دەکات بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئازادی و ژیانی شایستە بە دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبوونی گونجاو و داهاتێکی گونجاو بۆیان، لە پێناو پاراستنی کەرامەتی هاووڵاتیانی و

ش. س. م.

١- مادەی ١٦ی دەستوری کۆماری عێراقی ساڵی ٢٠٠٥.

٢- د.ظافر احمد منديل، المواجهة الدستورية لظاهرة التسول في العراق، مجلة كلية قانون للعلوم القانونية، مجلد ١١، عدد ٤٣، لعام ٢٠٢٣، ص٣٧٨، جامعة تكريت.

٣- المادة /٢٢/ أولا من دستور العراق لسنة ٢٠٠٥

ڕێگریکردنیان لەوەی بەهۆی سوالکردنەوە زەلیل نەبن)[1]، بۆیە دەقی دەستوورمان هەیە باس لەوە دەکات کە: (دەولەت گەرەنتی ئاسایشی کۆمەلایەتی و تەندروستی بۆ عێراقییەکان دەکات لە کاتی پیری، نەخۆشی، پەککەوتەیی، بێلانەیی، هەتیوبوون یان بێکاری)[2]. زۆر یاسا هەن کە مامەلەیان لەگەل ئەمەدا کردووە، دوای ئەوەی خرانە ناو دەستوورەوە، دیارترینیان یاسای پاراستنی کۆمەلایەتی بوو، بۆ پاراستنی کەسی هەژار و پەککەوتە بوو، تاکو لە ئیستغلالکردنی باندە تاوانکارییەکان بپارێزرێن و لە سوالکردندا بەکارنەهێنرێن. زۆر بڕگە لە دەستووری عێراقدا هاتووە و ئامانج لێی پاراستنی ئازادی و کەرامەتی مرۆڤ و دابینکردنی ئامرازەکانی ژیانکردنێکی شایستە بووە[3]، هەروەها لە میانەی پێداچوونەوە بەو دەقە دەستوورییانەی ئاماژەیان پێکراوە لە دەستووری کۆماری عێراق بۆ سالی ٢٠٠٥. بۆمان

ش. س. م.

١- بڕوانە: مادەی ٣٠ / برگەی یەکەم دەستووری عێراق بۆ سالی ٢٠٠٥ کە تێیدا هاتووە "دەولەت گەرەنتی دەدات بە تاک و خێزان بەتایبەتی مندال و ژنان، ئاسایشی کۆمەلایەتی و تەندروستی و مەرجە سەرەتاییەکانی ژیان لە ژیانێکی ئازاد و کەرامەتدا، ژیانێک کە داهاتێکی گونجاو و خانووبەرەی گونجاویان بۆ دابین دەکات". ٣- بڕوانە: مادەی ٣٠/دووەمی دەستووری عێراق ٢٠٠٥. بۆ زیاتر بڕوانە یاسای پاراستنی کۆمەلایەتی ژمارە ١١ی سالی ٢٠١٤ کە گرنگیدان بەم چینە کردە کارە لە پێشینەکانی خۆی.

٢-- بڕوانە: مادەی ٣٠/ برگەی دووەم دەستووری عێراق ٢٠٠٥. بۆ زیاتر بڕوانە یاسای پاراستنی کۆمەلایەتی ژمارە ١١ی سالی ٢٠١٤ کە گرنگیدان بەم چینە کردە ئەولەویەت.

٣- مادەی ٣٣ برگەی یەکەم، خودی دەستوور لەبەرچاو بگیرێت کە دەلێت هەموو کەسێک "مافی ژیانی لە بارودۆخێکی ژینگەیی تەندروستدا هەیە"، هەروەها مادەی ٣٧ یەکەم // هەمان دەستوور کە دەلێت "ئازادی و کەرامەتی مرۆڤ پارێزراوە"

دەردەکەوێت، کە هەموویان جەختیان لەسەر ئەمانەی خوارەوە کردووەتەوە:

١- دابینکردنی مافی ژیان و ئاسایش و ئازادی لە هەموو لایەنەکانی ژیانی تاک و دەوڵەتدا.

٢- دابینکردنی کارێکی شیاو و گونجاو بۆ هەر تاکێک، بە شێوەیەک کە گەرەنتی ژیانێکی ئازاد و شایستەی بۆ بکات و دووری بخاتەوە لە هەر بارودۆخێک، کە بتوانێت ببێتە هۆی لادانی لە ڕێبازی ڕاست و دروست.

٣ ڕێگریکردن لە هەموو جۆرەکانی توندوتیژی خێزانی و کۆمەڵایەتی و دەستدرێژیکردن، کە ئەمەش ژیانێکی سەلامەت بۆ تاکەکەس دوور لە ئیستغلالکردن دابین دەکات.

٤ قەدەغەکردنی هەموو جۆرە ئیستغلالێکی ئابووری کە لە بەرامبەردا پێشێلکردنی هەموو ئەو گەرەنتیانەی سەرەوەیە.

٥ دەستەبەرکردنی تەندروستی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی لەڕووی دابینکردنی ژینگەیەکی تەندروست و بەدواداچوون و چاودێریکردنی نەخۆش و دابینکردنی پەروەردە و چاودێریکردنیان.

٦ پاراستن و پارێزگاریکردن لە کەرامەتی مرۆڤ.

لە هەموو ئەوانەی پێشووەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە دەستووری عێراق حەزی دەکرد هەموو ئەو گەرەنتی و مافە پێویستانە دابین بکات، کە هەموو ئەو توانایانەی بۆ دابین دەکات. کە بە کەمترین ماف و گەرەنتی دادەنرێت، کە دەبێت بۆ هەموو تاکێک دابین بکرێت چالاککردنی دەقە دەستوورییەکانی کە لە دەستووری عێراقدا لە ساڵی ٢٠٠٥دا هاتووە، تایبەتە بە مافە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، دەوڵەتی عێراق ناچاردەکات بەرپرسیارێتی دابینکردنی ژیانێکی پڕ کەرامەت بۆ

گەل و خێزانە عێراقیەکان بگرێتە ئەستۆ، بەتایبەت عێراق خاوەن سامان و تواناییەکی مادی گەورەیە.

## لقی دووەم
## ئامرازی چارەسەری تاوانی سواڵکردن لە پەیماننامە و ڕێککەوتنامەی نێودەوڵەتیەکان

پەیمانی نێودەوڵەتی ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە بواری یاسای نێودەوڵەتیدا، بۆیە لەلایەن توێژەرانەوە گرنگییەکی زۆر دراوە بە توێژینەوە کردن لەبارەی پەیماننامەکان و کاریگەرییەکان لەسەر دەوڵەتان، بەو پێیەی ئەو پەیماننامە و ڕێککەوتنانە سەرچاوەی سەرەکی یاسای نێودەوڵەتین، دوای ئەوەی پێشتر داب و نەریت ئەم پێگەیەی داگیرکردبوو[1]. بەر لەوەی پێناسەی پەیماننامە بکەین. دەبێت بگوترێ کە پەیماننامەکە چەندین وەسفی (هاوواتای) هەیە، گرنگترینیان بریتین لە: ( میساق، ڕێککەوتننامە، پەیماننامە، پرۆتۆکۆل)[2] و ئەوانی

ش. س. م.

١- د.صلاح البصيصي، المعاهدة الدولية والرقابة عليها في ظل الدستور العراقي الجديد مجلة العربي للعلوم الاقتصادية والإدارية العدد ١ ٢٠١٤ ص٤٢١

٢- پەیماننامەکە پێی دەوترێت ڕێککەوتن هەرکاتێک پێویستی بە جێبەجێکردنی هەندێک مەرج هەبێت، کە تەنها بە تەواوکردنی دەتوانرێت تەواو بکرێت، وەک ڕێککەوتننامەی ژنێڤی ساڵی ١٩٤٩ و ڕێککەوتننامەی ڤیەنا بۆ یاسای پەیماننامە. هەرچی میساقە ئەوا بۆ وەسفی بەڵگەنامەی نێودەڵەتی بەکاردێت، کە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان دادەمەزرێنێت، وەک میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٤٥ و پرۆتۆکۆلیش، ئەو ڕێککەوتنەیە کە بۆ جێبەجێکردنی ڕێککەوتنێکی دیاریکراو دامەزراوە و نوێنەرایەتی کردارە تەواوکەرەکان یان جێبەجێکارەکانی بۆ دەکات، وەک پرۆتۆکۆلەکانی جنێڤ ساڵی ١٩٧٧ کە هات بۆ جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەکانی جنێڤ.

دیکە، پەیماننامە بەم شێوەیە پێناسە دەکرێت: (ڕێککەوتنی نێوان دوو کەس یان زیاتر لە کەسەکانی یاسای گشتی نێودەوڵەتی، بە ئامانجی هەندێک کاریگەری یاسایی دیاریکراو داهێنراون)[1]. یاسادانەری عێراقی (پەیماننامە)ی لە یاسای پەیماننامەکانی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٧٩ بەمشێوەیە پێناسەکردووە: (ڕێککەوتنی چەندین ئیرادە، بەشێوەیەکی نووسراو و چەسپاو، لەنێوان دوو کەس یان زیاتر لە کەسە یاساییەکانی نێودەڵەتی، کە لە برگەی یەکی ئەو مادەیە ناویان هاتووە[2]، بەمەبەستی داهێنانی لێکەوتەکانی یاسایی، کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری حوکمەکانی یاسای نێودەوڵەتی، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ناونان و ژمارەی ئەو بەڵگەنامەی کە لەم ڕێککەوتنە دەنووسرێنەوە، چ بەناوی بەڵێننامە یان ڕێککەوتننامە، یان پرۆتۆکۆل بێت)[3]. هەرچەندە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی مامەڵەی لەگەڵ چەندین ڕێککەوتنی کردووە لەسەر پرسی پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ و دابینکردنی ئامرازەکان بۆ ژیانێکی ئاسوودە و لە نێو ئەو ڕێککەوتنە نێودەوڵەتیانە و بنەما نێودەوڵەتیانەشدا (جارنامەی گەردوونی مافی مرۆڤ) هەیە کە بە بڕیارنامەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەرچووە لە دانیشتنی ژمارە ٢١٧ لە ١٩٤٨/١٠/١٢، کە چەندین دەقی تێیدایە، لەگەڵ سوالکردندا ناگونجێت، کە ئەمەش دەبێتە هۆی زەلیلکردنی مرۆڤ یان پێشێلکردنی

ش. س. م.

١- د. عصام العطية، قانون الدولي العام، الطبعة الخامسة بغداد ١٩٩٢، ص ٧٩ -٨٠

٢- المادة ١ فقره ١ من من قانون المعاهدات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٧٩. کە باس لەوە دەکات کە ئەم یاسایە ئەو پەیماننامە نێودەوڵەتیانە دەگرێتەوە کە بەناوی کۆماری عێراق یان حکومەتەکەی لەگەڵ وڵاتێکی تر یان وڵاتان یان حکومەتەکانیان یان ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی یان هەر کەسێکی تری یاسایی نێودەوڵەتی کە لەلایەن کۆماری عێراقەوە دانپێدانراوە.

٣- بڕوانە: مادەی ١ برگەی ٢ لە یاسای گرێبەستی پەیمانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٧٩.

کەرامەتی، لە نێو ئەو دەقانە هاتووە: (هەر تاکێک مافی ژیان و ئازادی و ئاسایشی خۆی هەیە)[1]. هەروەها مافی کارکردنی بۆ هەموو تاکێک بەبێ جیاوازی دووپاتکردەوە، کە تێیدا هاتووە: (هەموو مرۆڤێک مافی کارکردنی هەیە)[2]. "هەروەها دەقێک لە نێوان جارنامەکە هەیە داوای دابینکردنی ئاستێکی شایستەی ژیان بۆ هەموو تاکێک دەکات و سەرباری ئەوەی داوای دوورکەوتنەوە لە هەموو شتێک دەکات، کە کەرامەتی تاک دادەبەزێنێت، جەختی لەوە کردەوە کە: (هەر کەسێک مافی ئەوەی هەیە ژیانێک بەسەر بەرێت کە تێیدا تەندروستی و خۆشگوزەرانی بۆ خۆی و خێزانەکەی دابینکرا بێت)[3]. ئێمە دەبینین، لە ڕێگەی ئەم دەقانەی سەرەوە، گرنگی بە بەدەستهێنانی هەلی کار بۆ هەر تاکێک، پاراستنی کەرامەتی مرۆڤایەتی، نەک بە کۆیلەکردنی مرۆڤەکان، گەیشتن بە ئاسایشی تەندروستی و ئاستی ژیانی هەر تاکێک. هەروەها لە (پەیماننامەی نێودەوڵەتی بۆ مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانیەکانی ساڵی ١٩٦٦ کە عێراق لە ساڵی ١٩٧١ پەسەندی کرد، لەنێو دەقەکانیدا مافی کارکردن بۆ هەموو کەسێک دیاریکراوە، حکومەتی عێراقیش ڕێوشوێنی پێویست گرتۆتەبەر بە مەبەستی دەستەبەرکردنی ئەم مافە، لەگەڵ پێویستی دەستەبەرکردنی ژیانێکی شایستە بۆ تاک و خێزانەکەی[4].

ش. س. م.

١- بڕوانە: مادەی ٣ی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤی ساڵی ١٩٤٨.

٢- بڕوانە: مادەی ٢٣ی جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی ساڵی ١٩٤٨.

٣- بڕوانە: مادەی ٢٥ی جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی ساڵی ١٩٤٨.

٤- سەیری: مادەی ١/٦ی پەیماننامەی نێودەوڵەتی مافە ئابوری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی ساڵی ١٩٦٦ کە تێیدا هاتووە: (دەوڵەتانی ئەندام لەم پەیماننامەیەدا دان بە مافی کارکردندا دەنێن، کە مافی کارکردنی هەموو کەسێک دەگرێتەوە کە دەرفەتی ئەوەی هەبێت بژێوی ژیانی بە کارێک دابین بکات، کە

پەیماننامەی نێودەوڵەتی مافە مەدەنی و سیاسییەکانی ساڵی ١٩٦٦ کە عێراق لە ساڵی ١٩٧١ پەسەندی کرد، لەنێو دەقەکانیدا باسی کەرامەتی مرۆڤ و دەستەبەرکردنی ماف بۆ هەموو تاکێک و قەدەغەکردنی کۆیلەکردنی هەر کەسێک یان بازرگانیکردن بە کۆیلە، ئەمەش لەمیانەی ڕێگریکردن لە هەر کەسێک کە بە کۆیلە بکرێت، لە پێناو پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ و زەلیل نەکردنی، هەموو ئەم دەقانە لەگەڵ بوونی سواڵکەر ناکۆکن[1]، هەروەها ڕێککەوتننامەی مافی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکانی ساڵی ٢٠٠٧یش هەمان ڕۆڵی گێڕا، لە ڕێزگرتن لە کەرامەتی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان و دووپاتی بەرەنگاربوونەوەی حاڵەتەکانی ئیستغلالکردنی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان لە سواڵکردندا کردەوە، تێیدا هاتووە: (ڕێزگرتن لە کەرامەتی کەسەکان و سەربەخۆییان بە ئازادی بڕیاردان لەسەر چارەنووسی خۆشیانەوە)[2]. هەروەها لەو ڕێککەوتنامە هاتووە: (کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت دەتوانن بە شێوەیەکی یەکسان لەگەڵ کەسانی دیکە سوودمەند بن لە خزمەتگوزاری و ئاسانکارییە کۆمەڵایەتییەکان وەک چۆن بۆ خەڵکی گشتی ڕەوایە بۆ ئەوانیش ڕەوایە، دەبێت ئەم خزمەتگوزاریانە وەڵامی پێداویستییەکانیان بدەنەوە)[3]. هەروەها یەکێک لە ئامانجەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیە دابینکردنی هەلی کارکردنی یەکسانە بۆ

---

هەڵیدەبژێرێت یان لای پەسندە، بە ئازادی و ڕێوشوێنی گونجاو بگرێتەبەر بۆ پاراستنی ئەم مافە).

١- بڕوانە مادەی ٨/١ لە پەیماننامەی نێودەوڵەتی مافە مەدەنی و سیاسییەکانی ساڵی ١٩٦٦ کە دەڵێت "نابێت کەس بکرێتە کۆیلە و کۆیلایەتی یان بازرگانی بە کۆیلە بەهەموو شێوەکانیەوە قەدەغە دەکرێت"

٢- المادة ٣ من اتفاقية حقوق الأشخاص ذوي الإعاقة لعام ٢٠٠٧.

٣- المادة ١٩/ج من اتفاقية حقوق الأشخاص ذوي الإعاقة لعام ٢٠٠٧.

ئەو کەسـانەی کە خـاوەن پێداویسـتییە تـایبەتن و دەبێـت کـار بـۆ کەمئەندامان دابین بکرێت، لە بەندەکانی ڕێککەوتنامە هاتووە: (دەوڵەتانی ئەندام دان بە مافی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان دەنێن بۆ کارکردن لەسەر بنەمای یەکسان لەگەڵ ئەوانی دیکە بەم شێوەیەی خوارەوە:

أ/ قەدەغەکردنی جیاکاری لەسەر بنەمای کەمئەندامی.

ب/ پاراستنی مافی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان بۆ هەلومەرجی کارکردنی دادپەروەرانە و گونجاو لەسەر بنەمای یەکسان لەگەڵ ئەوانی تـر، لەوانەش دەرفەتـی یەکسـان و مـووچەی یەکسـان بـۆ ئەنجامـدانی کارێک کە بەهـای یەکسـانی هەبێت)[1]. هەروەهـا زۆر دەق هەیە کە باس لە پاراسـتنی ئەو منـدالانە دەکەن، کە دەبـنە قوربـانی هەڵوەشـاندنەوەی خێزان و هەژاری و بێبەشی لە سـاڵی ١٩٨٩ ئەنجومەنی گشـتی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێککەوتنـامەی مافەکانی منداڵی دەرکرد، کە عێراق لە سـاڵی ١٩٩٤ پەسـەندی کرد و جەختی لەسـەر پاراسـتنی منداڵ لە هەر جـۆرە ئیسـتغلالێک کـردەوە. زۆر دەقـی تێـدا هـاتووە جەخـت لەسـەر مافەکـانی منـالان دەکـاتەوە، لەوانە: (دەوڵەتـانی ئەنـدام بە ڕەچـاوکردنی ماف و ئەرکەکانی دایک و باوکی منال، سەرپەرشـتیارانی، یـان کەسـانی دیـکە کە لە ڕووی یاسـاییەوە بەرپرسـیارن، بەڵـێن دەدەن کە منـداڵەکە گەرەنتـی پاراسـتنی پێویسـت و گرنگیـدان بە خۆشگوزەرانی بـکەن، بـۆ بەدیهێنـانی ئەمەش ولاتـان لێکـۆڵینەوە دەکەن و هەمـوو ڕێوشـوێنێکی یاسایی و ئیداری گونجاو دەگرنە بەر)[2]. هەروەهـا لە ڕێککەوتنـامەکەدا هـاتووە کە (دەوڵەتـانی ئەنـدام هەمـوو ڕێوشـوێنێکی یاسـایی، کـارگێڕی، کۆمەلایەتی و پەروەردەیـی گونجـاو دەگرنەبەر بـۆ پاراسـتنی منـداڵ لە هەمـوو جۆرەکـانی تونـدوتیژی، زیـان، دەسـتدرێژی جەسـتەیی یـان

ش. س. م.

١- المادة ٢٧/ / ب من اتفاقية حقوق الأشخاص ذوي الإعاقة لعام ٢٠٠٧.

٢- المادة: ٢/٣ من اتفاقية حقوق الطفل لعام ١٩٨٩.

دەروونی، پشتگوێخستن، خراپ مامەڵەکردن و ئیستغلالکردن، لەوانەش دەستدرێژی سێکسی لەکاتی چاودێریکردنی لەلایەن دایک و باوک(ەکان) یان سەرپەرشتیاری یاسایی، یان هەر کەسێکی تر)[1].
هەروەها لە دابینکردنی ئاستی ژیانی گونجاو بۆ منداڵ و پابەندکردنی دەوڵەتەکان بە پەروەردەکردنی منداڵان و هەموو ئەم دەقانە کاردەکەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی سواڵکردن لە ڕێگەی پابەندبوونی دەوڵەتەکان بەم بڕگانە. لە هەموو ئەوانەی سەرەوە، بۆمان دەردەکەوێت، کە زۆرێک لە ڕێککەوتنە نێودەوڵەتییەکان بە ئامانجی ڕێزگرتن لە کەرامەتی خەڵک و دابینکردنی ئامرازەکان بۆ ژیانێکی ئاسوودە و دابینکردنی هەلی کار بۆیان، ئەگەر ئەم ڕێککەوتنانە وەکو ئەوەی دارێژراون جێبەجێ بکرێن ئەوا ڕێگری دەکەن لە حاڵەتەکانی سواڵکردن[2].

ش. س. م.

١- المادة: ١/١٩ من اتفاقية حقوق الطفل لعام١٩٨٩.

٢- د. ابو حسن جاسم ذربة، جريمة الاستغلال الجنسي للأطفال في قانون العراقي والقوانين المقارنة، مكتبة القانون المقارن، بغداد، ٢٠٢٣، ص٢٢.

# باسی دووەم
# ئامرازەکانی چارەسەری نیشتمانی تاوانی سواڵکردن

لەم بەشەدا باس لە ئامرازەکانی چارەسەری نیشتمانی بۆ تاوانی سواڵکردن دەکەین، لەسەر ئاستی یاساکان و وەزارەتە پەیوەندیدارەکان، ئەمەش لە دوو تەوەر ئەنجامی دەدەین: یەکەمیان کە تیایدا باس لە ئامرازەکانی چارەسەر لەرووی یاسادانان دەکەین، لە دووەم تیایدا باس لە ئامرازەکانی چارەسەری تاوانی سواڵکردن لەلایەن وەزارەتە پەیوەندیدارەکانەوە دەکەین، لەوانەش وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی، هەروەها وەزارەتی ناوخۆ، چونکە ئەوەی ئەوان ڕۆڵێکی کاریگەر و بەرچاویان هەیە لە جێبەجێکردنی بڕگەکانی یاساکە، ئێمە یەک لە دوای یەک باسی ئەم بڕگانە دەکەین.

# تەوەری یەكەم
# ئامرازەكانی چارەسەركردن لەرووی یاساكان

ولاتان یاساكانی تاوانیان وەک پایەیەكی بنەڕەتی بۆ خۆپاراستن له تاوان پەسەند كردووه، لە ڕێگا یاسا سزاییەكان، كە تاوانباركردنی چالاكییە كۆمەڵایەتییە مەترسیدارەكان یان هەڕەشەكردن لە ئاسایشی هاوولاتیان. لەڕێگەی گرتنەبەری سیاسەتێكی توندتر بۆ سزادان، كە دەبێتە قەڵغانی سزایی كە ڕێگری دەكات لە تاوانبار لە ترسی سزادان بەرەو تاوانكاری نەچێت[1]. ئێمە لە بەشی دووەمدا مامەڵەمان لەگەڵ سزادا كرد، بەهۆی كاریگەرییەكەی لەسەر چارەسەركردن، بەلاَم باس لەو سزا بەدیلانە دەكەین كە یاسادانەر وەک جێگرەوەیەک بۆ سزا پەنای بۆ بردووه، بەو پێیەی زۆربەی یاساكان دان بەوە دەنێن، كە سزای بەدیل باشترە لە سزای زەوتكردنی ئازادی، بۆ ئەوەی ببێتە قەڵغان لەبەردەم تاوانباران تاوان نەكەن و ڕەفتارەكانیان چاک بكەنەوە، بەبێ ئەوەی پێویست بكات زیندانی بكرێن و ببنە بارگرانی بەسەر خەرجییەكانی دەوڵەتەوە، بۆیە پێویستە ئەم سزایانە ئیلهامیان لە ڕۆحی كۆمەڵگا و داب و نەریتەكانی وەرگرتبێت، بۆ ئەوەی كاریگەرییەكەی زیاد بكات[2]. هۆكاری ئەوەی كە زۆربەی یاساكان بۆ سەر سزای بەدیل دەگەڕێنەوە، بەهۆی تێڕوانینی خراپی كۆمەڵگایە بۆ تاوانبار و تاوانەكە،

ش. س. م.

١- د. عصمت عدلي، الجريمة وقضايا السلوک الانحرافي بين الفهم والتحليل دار الجامعة الجديدة، الإسكندرية، ٢٠٠٩، ص ٣٧٩

٢- د. عبد الرحمن خلفي العقوبات البديلة دراسة فقهية تحليلية مقارنة ط ١ المؤسسة الحديثة للنشر لبنان ٢٠١٥ ص ٤٩.

که به هاندەرێک دادەنرێت بۆ ئەنجامدانی تاوان، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی تاوانبـار نەگەڕێتەوە نـاو کۆمەڵگـا، لێـی نـامۆ بێـت و لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵگاوە متمانەی پێ نەکەن، بۆیە بەپەلە بەرەو تاوانکاری دەچێت)[1]. بیـرۆکەی سـزای جێگـرەوە لەسـەر بنەمـای چاکسـازی و شیاندن دامەزراوە، کە پشـت یە فەلسـەفەیەک دەبەسـتێ، کە پێـی وایە (تاوانبـار بە ئیرادەیەکـی سـەربەخۆیانە لە ڕەفتـارێکی هەڵەی کـردووە، بـۆیە سـزای بەدیـل ئازارەکـانی لـێ دوور دەخـاتەوە و ئـامرازی یاسادانەرە، بۆ پەرەپێدان و چاکسازیکردن لە خودی تاوانبارەکە، بەو پێیەی ئەم بەدیلانە لەسـەر بنەمـای شـەرعیەت دامەزراون، بەو پێیەی دەوڵەت دەسـەلاتی ئەوەی هەیە سـزای تاکەکـان بـدات لەسـەر ئەو کـارانەی کە لەڕووی یاسـاوە تـاوانن، سـەپاندنیان بەسـەر کۆمەڵێـک تاوانبار، کە مەترسی تاوانکارییان نیە، یان ئەگەر هەش بێت زۆر کەمە، بۆیە ئەم سزایانەیان لە دژی دەگیرێن بەر)[2].

مەبەست لە سزای جێگرەوە (کۆمەڵێک ئامرازی یاسایی ناتەقلیدییە، کە بە هـۆی حـوکمێکی جەزاییـەو بـۆ ئەو تاوانبـارانە دەردەچـن، کە تاوانباربوونیـان بە تـاوانی یاسـایی سـەلمێنراوە، بەلام تاوانەکەیـان هـی ئەوە نییە، کە ئازادیـان لـێ مەحـروم بکرێت)[3]. یاسـادانەری عێراقـی لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی سـاڵی ١٩٦٩ هەمـوار کـراو باسـی ئەوەی کـردووە، ئەو سـزایانە یـان ئەو ڕێوشـوێنانە بەسـەر تاوانبـاری سـوالکەردا دەسـەپێ، تـاکو لەلایەک کۆمەڵگـا بپـارێزێ، لەلایەکـی

ش. س. م.

١- د. عمر السعيد رمضان دروس في علم الإجرام دار النهضة العربية للطباعة والنشر بيروت ١٩٧٢ - ص ١٤٦ .

٢- د. تميم طاهر احمد، بدائل العقوبات السالبة للحرية قصيرة الأمد، رسالة ماجستير مقدمة إلى كلية القانون جامعة بغداد - ١٩٨٨ - ٨٢-٨٣

٣- د. تميم طاهر احمد، المصدر السابق ص ٧٩.

دیکەشەوە رەوشی ژیانی سواڵکەرەکە باشتر بکات و چارەسەری بکات و لێنەگەڕێ تێکەڵاوی تاوانباران ببێتەوە، ئەو رێوشوێنانە رێوشوێنی شیاون و بۆ دادگا هەیە لەبری سزادانانی ئەسڵی بیانگرێتەبەر، یاسادانەرەکە سەبارەت بەو بابەتە دەڵێ: (دادگا دەتوانێت لەبری ئەوەی سزای سواڵکەرەکە بدات، کە لە مادەی پێشوودا هاتووە، فەرمانی ئەوە بدات، کە بۆ ماوەیەک کە لە ساڵێک زیاتر نەبێت لە خانەیەک کارپێکردن دابنرێت، ئەگەر توانای کارکردنی هەبێت، ئەگەر نەیتوانی کار بکات و پارەیەکی نەبێت کە لێیەوە بژی لە شوێنێکی داڵدەدان، ماڵێکی بەساڵاچووان، یان دامەزراوەیەکی خێرخوازی دانپێدانراو دابنرێت)[1]. ئەم تەوەرەدا بەم شێوەی خوارەوە دابەش دەکەین:

## لقی یەکەم
## دانانی سواڵکەر لە خانەی کارپێکردن

یەکەم سزای بەدیل کە یاسادانەر پەنای بۆ دەبات، دانانی لە خانەی کارپێکردنە و ئەمەش یەکێکە لە ئامرازی چارەسەرکردن، کە ئامانجی دروستکردنی شێوازێکی ژیانی رێکوپێکە، بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەری عێراق لە چوارچێوەی بڕگەکانی یاسای سزاداندا باسی پێناسەی ئەم جۆرە سزای بەدیلانەی نەکردووە، بەڵام فیقهـ وەک رێکارێک پێناسەی کردووە کە: (رێگری لە ئازادی دەکات و ئامانجی راهاتنی تاوانبارە لەسەر کارکردن و پەرەپێدانی هاووڵاتیبوون و ملکەچبوون بۆ سیستەمەکانی وەک ئامادەکارییەک بۆ راهاتنی بە

ش. س. م.

١- المادة ٣٩١ قانون العقوبات العراقي رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩ المعدل

شێوازێکی ژیانی ڕێکخراو کە لەگەڵ یاسادا بگونجێت)[1]. هەندێکی تریش وەک پێوەرێک بۆ "لێسەندنەوەی ئازادی" پێناسەیان کردووە کە بریتییە لە زیندانیکردنی سزادراو لە شوێنێکدا کە دەستکەوتی دەبێت، یان کارێکی شەرافەتمەندی دەست دەکەوێ[2].

بۆیە داواکارییەکە بۆ سواڵکەر و کەسی سەرگەردان جێبەجێ دەکرێت ، نەوەک بۆ نەوجەوانان، سزادراو پاداشتێک بۆ کارەکەی وەردەگرێت، کە لە نێوان خێزانەکەی و وەبەرهێنەرەکەدا دابەش دەکرێت.

لە کاتێکدا، بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەری عێراق مامەڵەی لەگەڵ دانانی لە شوێنێکی دیاریکراو کردووە، وەک یەکەم جۆری سزای بەدیل، کە دەسەڵاتی دادوەری پەنای بۆ دەبات لەکاتی ڕەچاوکردنی دۆسیەی سواڵکەرێک، ئەویش دانانیەتی بۆ ماوەیەک کە لە ساڵێک زیاتر نەبێت لە شوێنێکی کارپێکردن. یاسادانەر مەرجی ئەوەی دانابوو، کە بتوانێت کار بکات، ئەگەر نە توانێت یان خاوەن پێداویستی تایبەت بوو، ناچنە ژێر ئەم جۆرە سزا بەدیلەوە[3]. سەرەڕای ئاراستەی حکومەتی عێراق بۆ کردنەوەی بەشی کارپێکردن و قەرزدان لە وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەلایەتی، بەشی کار لە سەرجەم پارێزگاکان و

ش. س. م.

١- د. محمود نجيب -حسني شرح قانون العقوبات اللبناني القسم العام -دار النهضة العربية بيروت ١٩٨٤- ص ٩٠٥.

٢- د. سمير غالية - شرح قانون العقوبات القسم العام - مصدر سابق ص٤٣٩.

٣- سەیری: مادەی ٣٩١ لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩، هەموارکراو، کە تێیدا هاتووە: (دادگا دەتوانێت لەبری سزادانی سواڵکەرێک بەو سزایەی کە لە مادەی پێشوودا دیاریکراوە، فەرمانی دانانی بۆ ماوەیێک کە زیاتر نەبێت ساڵێک لە خانووی کارکردن ئەگەر توانای کارکردنی هەبێت، یان لە شوێنی داڵدەدان،ماڵێک بۆ بەساڵاچووان، یان دامەزراوەیەکی خێرخوازی دانپێدانراو، ئەگەر نەتوانێت کار بکات و پارەی نەبێت بۆ ئەوەی لێی بژی).

ناوەندەکانی ڕاهێنانی پیشەیی، بەڵام بە مە بە ستی ڕاهێنانی بێکاران دامەزراوە، نەوەک پەناگەیەک بێت بتوانێت سواڵکەری تێدا دابنرێت، بە مەبەستی کارکردن و فێربوونی پیشەیەک، دەتوانێت یارمەتی بدات بۆ نەهێشتنی بێکاری، هەربۆیە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم جۆرە سزا یان ڕێکارە بەدیلە لە یاساکانی عێراقدا ڕاگیراوە، بۆیە هیوادارین یاسادانەری عێراق ناوەندەکانی ڕاهێنانی پیشەیی لە پارێزگاکان پابەند بکات بە پەروەردەکردن و ڕاهێنانی سواڵکەران بە مەبەستی ڕاهێنان و فێرکردنی پیشەکانیان، چونکە ئەم سەنتەرانە تیمی ڕاهێنەری شارەزا و ڕاوێژکاری باشیان هەیە، کە توانای پەروەردەکردنی سواڵکەریان هەیە، داوا لە یاسادانەر دەکەین، ئەگەر ئەو سواڵکەرانە ئەو سەنتەرانەیان بێ مۆڵەت جێهێشت یان دووبارەکردنەوەی حاڵەتی سواڵکردن دوای فێربوونی پیشە یان پیشەسازی دەستی، سزایەکی توندیان بەسەردا بسەپێنێت.

## لقی سێیەم
## دانانی سواڵکەر لە پەناگە

دووەم سزای جێگرەوە کە یاسادانەر پەنای بۆ دەبات یان جۆری دووەمی ئامرازی چارەسەرکردنە بۆ تاوانی سواڵکردن. یاسادانەری عێراق کاتی ئەنجامدانی تاوانی سواڵکردن بەسەر سواڵکەردا دەسەپێندرێت، باسی لە پێناسەی ئەم جۆرە سزایە نەکرد.

دانان لە پەناگەدا دووەم سزای جێگرەوە کە یاسادانەری عێراق لە ماددەی ٣٩١ی یاسای سزادانی عێراقیدا باسی دەکات، کە مەرجی بۆ داناوە، دەبێت کەسەکە توانای کارکردنی نەبێت و پارەشی نەبێت، هەروەها بتوانرێت پەیوەندی پێوە بکرێت. ئێمە پێمان وایە بەهۆی

نەبوونی شوێنی حەوانەوە ئەم سزا جێگرەوە لە عێراقدا جێبەجێ ناکرێت، تاکو بۆ چارەسەرکردنی ڕەوشی سواڵکەران بەکاربێت، داوا لە یاسادانەر دەکەین، حکومەت رابسپێرێ روو لە دامەزراندنی شوێنی داڵدەدان بکات، بەمەبەستی پاڵپشتیکردنی خانەی تایبەتی بەساڵاچووان[1] و بێلانە و سواڵکەران. بۆ چارەسەرکردنی ئەم دیاردەیە، کە هەستی هاووڵاتیان ئازار و بریندار دەکات و بۆ پاراستنی کەرامەتی خەڵکی وڵات.

## لقی دووەم
## دانانی سواڵکەر لە خانەی بە ساڵاچووان

خانەی بەساڵاچووان واتە شوێنێک بۆ نیشتەجێکردنی بەساڵاچووان و پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی، تەندروستی، دەروونی، کولتووری و کات بەسەربردن، بۆ ئەوەی بتوانن بەسەر کاریگەرییەکانی کەمئەندامی خۆیاندا زاڵ بن. بۆ دەستەبەرکردنی ژیانێکی شایستە و ئارام بۆیان لە ماوەی مانەوەیان لەم خانەیە[2]. سەبارەت بە یاسادانەری عێراقیش باسی ئەم سزایە جێگرەوە سێیەمی لە چوارچێوەی بڕگەکانی یاسای سزادانی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ کە لە مادەی ٣٩١ی ئەو یاسایەدا هەمواركراو کرد و مەرجی ئەوەی خستۆتەڕوو کە سواڵکەرەکە توانای کارکردنی نەبێت و پارەی نەبێت و بتوانرێت پەیوەندی پێوە بکرێت، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەمە پێچەوانەی مەرجەکانی وەرگرتن لە خانەی بەساڵاچووانە، کە مەرجی ئەوەی دانابوو، کە دەبێت کەسی بەساڵاچوو نەخۆشییە گوازراوەکان و

ش. س. م.

١- المادة الثانية من نظام دور رعاية المسنين رقم ٤ لسنة ١٩٨٥ .
٢- المادة الثانية من نظام دور رعاية المسنين رقم ٤ لسنة ١٩٨٥ .

دەروونییەکان نەبێت و پێویستی بە چاودێری و چارەسەری پزیشکی بەردەوام نەبێت[1]. ئەگەر خانەی تایبەتمەند هەبێت بۆ چاودێریکردنی بەساڵاچووانی کەمئەندام ئەوانەی، کە پێویستیان بە چاودێری پزیشکی بەردەوام هەیە، ئەوا تەنها لە هەندێک پارێزگادا ئەو خانانەن کە ژمارەیەکی زۆر لە کەسانی بەساڵاچوو تێدایە، دەبینین دانان لە ماڵەکانی بەساڵاچووان تاکە جۆری سزای جێگرەوەیە کە لەبەردەم دادگاکان هەیە، لە کاتی گۆڕینی سزای زیندانیکردن بە سزای داڵدەدان، هەروەها خانەکانی دەوڵەت تەنها لە پێناو پاراستنی سواڵکەر ڕێگری لێدەکرێت تاکو تێکەڵ نەبن و چارەسەری مەیلی تاوانکارییان بکرێت[2]. بەڵام دەبینین کە کێشەیەک هەیە لە نیشتەجێکردنی سواڵکەران لە خانەکانی بەساڵاچووان، چونکە ئەم دامەزراوانە بە مەبەستی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری تەندروستی و کۆمەڵایەتی بۆ بەساڵاچووان ئامادەکراون، نەوەک بۆ ماڵیکردن و چارەسەرکردنی مەترسی تاوانکارییانی سواڵکەرەکان، ئەمەش بە پێچەوانەی هۆکاری دەرچوونی یاسای خانەی بە ساڵا چووانە.

---

ش. س. م.

١- بڕوانە مادەی ٤/سێیەم لە پەیڕەوی خانەی چاودێریکردنی ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٨٥ لە عێراق، کە تێیدا هاتووە کە پێویستە بۆ ئەو کەسانەی لە خانەی بەساڵاچووان وەرگیراون

یەکەم - عێراقی بێت یان فەلەستینی نیشتەجێی عێراق بێت. دووەم: دەبێت تەمەنی شەست ساڵی بۆ نێر و پەنجا و پێنج ساڵ بۆ مێ تەواو کردبێت. سێیەم - دوور بێت لە نەخۆشییە گوازراو دەروونییەکان و پێویستی بە چاودێری و چارەسەری پزیشکی بەردەوام نەبێت.

٢- بڕوانە: مادەی چوارەمی سیستەمی خانەکانی دەوڵەت ژمارە ٥ی ساڵی ١٩٨٦. خانەی دەوڵەت بۆ منداڵان سێ جۆر هەیە: یەکەم، خانەی دەوڵەتی بۆ منداڵان، بۆ چاودێریکردنی منداڵان تا ساڵی چوارەمی تەمەنیان تەواو دەکەن. دوانزەهەم سێیەم - خانەی دەوڵەتی نەوجەوانان بۆ چاودێریکردنی نەوجەوانان لە ساڵی سێزدەهەمەوە تا ساڵی هەژدەهەمیان تەواو دەکەن.

## لقی چوارەم
## دانانی سواڵکەر لە دامەزراوە خێرخوازییەکان

دوا جۆری سزای جێگرەوەیە کە یاسادانەر لەبری سزای ئەسڵی پەنای بۆ دەبات، بە مەبەستی مامەڵەکردن لەگەڵ سزای سواڵکردن، بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەری عێراق لە مادەی ٣٩١ی یاسای سزادانی عێراقی، مامەڵەی لەگەڵ ئەم جۆرە دانانە کردووە. ئەمە یەکێکە لەو ڕێوشوێنە کۆمەڵایەتیانەی کە تیایدا کەسانی کەمئەندامی دەروونی یان شێت چارەسەر دەکرێن، ئەنجومەنی سەرکردایەتی هەڵوەشاوەی ڕژێمی پێشوو، لە ڕێکەوتی ١٩٩٩/٢٣/٣ بڕیاریدا کە وەزارەتی تەندروستی توانای نەخۆشخانەی دەروونی زیاد بکات، بەمەبەستی چارەسەرکردن و چاککردنەوەی کەمئەندامانی دەروونی و بەمەبەستی چارەسەرکردن و شیاندنەوەی ئەو سواڵکەرانەی کەمئەندامی دەروونین بۆ لە خۆگرتنی ئەم توێژە[1]، بۆمان دەردەکەوێت کە پێویستە حکومەت ئەو جۆرە بڕیارانە جێبەجێ بکات، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە کەسانی دواکەوتووی دەروونی دەبینین بە شەقامەکان و لەبەردەم ترافیک لایتەکاندا دەسوڕێنەوە و سواڵ دەکەن، کەسیش ناتوانێت یارمەتی داراییان پێشکەش بکات، بۆمان دەردەکەوێت کە یاسادانەری عێراق هەمان مەرجەکانی لە دووەم و سێیەمی سزا جێگرەوەکان زیاد کردووە، ئەوانیش توانای کارکردنی نەبێ و پارەشی نەبێت بتوانرێت پەیوەندی پێوە بکرێت[2]. یاسادانەر داوای لە حکومەتی فیدراڵی کرد کە

ش. س. م.

١- ادم سميان ذياب جريمة التسول مصدر سابق ص١٦٣

٢- بڕوانە: مادەی ٣٩١ لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩، وەک هەموار کراو.

دامەزراوەیەک دابمەزرێنێت، چاودێری بەساڵاچووانی شێت بن، ئەو خانەیەی تەرخانی دەکەن توانای نیشتەجێبوونی هەبێت لە هەموو پارێزگاکاندا بوونی هەبێت، وەک پەیمانگایەک بۆ چاودێری و پەروەردەکردنی کەمئەندامان کاربکەن، کە ئاگاداری نابینایان و دواکەوتووانی دەروونی و کەڕ و لاڵ و پەککەوتە و ئیفلیجدارەکان بن[1].

---
ش. س. م.

١- بڕوانە: مادەی یەکەمی ڕێنماییەکانی ژمارە ٤ی ساڵی ١٩٩٢ی سیستەمی پەیمانگاکانی کەمئەندامان و پەروەردەکردنیان لە عێراق (نظام معاهد المعوقين وتعليمهم في العراق) ژمارە ٥ی ساڵی ١٩٩١، کە تێیدا هاتووە مەبەست لە پەیمانگاکان بۆ چاودێری و پەروەردەی کەمئەندامان، ئەو پەیمانگا کۆمەڵایەتی و پەروەردەییانەن کە سەر بە بەشی چاودێری کۆمەڵایەتین و ئامادەکاری دەکەن بۆ وەرگرتنی خوێندکارانی خاوەن پێداویستی تایبەت کە کەڕ، لاڵ، کەم بیستن، کەمئەندامی جەستەیی و دواکەوتووی دەروونی هەردوو ڕەگەزیان هەیە بۆ مەبەستی فێرکردنیان.

# تەوەری دووەم
# ئامرازەکانی چارەسەرکردنی تاوانی سواڵکردن لەلایەن وەزارەتە پەیوەندیدارەکانەوە

لەم تەوەرەدا، لە دوو لقـدا بـاس لە گرنگتـرین ئامرازەکـانی چارەسەرکردن دەکەین، لەو وەزارەتانەی کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ ئەم تـوێژەی کۆمەڵگـادا هەیە، یەکەمیـان تەرخـان دەکەیـن بـۆ ڕوونکـردنەوەی ئامرازەکـانی چارەسـەرکردنی تـاوانی سـواڵکردن لە وەزارەتەکانی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی، پاشان لە دووەمدا باس لە دەسـەڵاتی جێبەجێکـردن دەکەیـن لە وەزارەتـی نـاوخۆ، بـۆیە بـاس لە ئامرازەکانی چارەسەرکردن لەلایەن وەزارەتی ناوخۆوە دەکەین.

## لقی یەکەم
## ئامرازەکانی چارەسەرکردنی تاوانی سواڵکردن لە وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی

وەزارەتـی کـار مـامەڵە لەگەڵ تـوێژە هەژار و بێبەشـەکانی کۆمەڵگا دەکـات، بەهـۆی ئەو یارمەتییـانەی مانگـانە دابینـی دەکـات و چـاودێریکردنی نەوجەوانـان و بەسـاڵاچووان ڕۆڵێکـی گەورەی لە چارەسـەرکردنی دیـاردەی سـواڵکردن هەیە، وەزارەتـی کـار لە عێـراق ڕۆڵێکـی کـاریگەر دەگێڕێـت لە چارەسـەرکردنی ئەم تـاوانە لە ڕێـگەی بەرنامەکـانییەوە، کە ئـێمە باسـی دەکەیـن، وەک چـۆن لە یاسـای هەموارکراوی وەزارەتی کـار ژمـارە ٨ی سـاڵی ٢٠٠٦ عێراقی لە بەشـی

سێیەمی ئەرکەکانی ئەم یاسایەدا باسکراوە، کە کردوویەتی ئامانجی خۆشی ئەویش بریتیە لە: (دەستەبەرکردنی چاودێری کۆمەلایەتی بۆ خێزانە کارکەرەکان و منداڵانی کرێکاران)[1]. هەروەها ئامانجێکی دیکەی (دابینکردنی هەلی کاری یەکسانە بۆ هەموو کەسێک کە توانای ئەنجامدانی کاری هەیە)[2]. و هەروەها یەکێک لە ئامانجە گرنگەکانی بریتیە لە (بنبڕکردنی هەژاری لەڕێگەی پێشکەشکردنی هاوکاری بۆ ئەو هەژارانەی کە توانای کاریان نیە و ئامادەکردنی ئەوانەشی توانای کارکردنیان هەیە لەرێگەی پاڵپشتی کردنی پرۆژەی وەبەرهێنانی بچووک)[3]، هەروەها وەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە ژمارە ١٢ی ساڵی ٢٠٠٧ هەمان بەمەست و ئامانجی سەرەوەی هەیە.

داواکارییەکانی وەزارەت بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی ئەو تاکەی، کە لە خوار هێلی هەژارییەوەن، رۆلێکی سەرەکییان هەبووە و لە ئەنجامی ئەم داواکارییەدا، یاسای تۆری پاراستنی کۆمەلایەتی ژمارە ١١ی ٢٠١٤ دەرچوو[4]، بڕگەکانی ئەم یاسایە بەسەر توێژێک لەو

ش. س. م.

١- بڕوانە مادەی ٣/٨ لە یاسای وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەلایەتی عێراقی ژمارە ٦ی ساڵی ٢٠٠٨ کە هەموار کراوەتەوە

٢- بڕوانە مادەی ٣/٩ لە یاسای وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەلایەتی عێراقی ژمارە ٦ی ساڵی ٢٠٠٨ وەک هەموارکراو

٣- بڕوانە مادەی ١٠/٣ لە یاسای هەموارکراوی وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەلایەتی ژمارە ٦ی ساڵی ٢٠٠٨، هەروەها بەشی یازدەیەمی یاسای کار و کاروباری کۆمەلایەتی هەرێمی کوردستانی عێراق ژمارە ١٢ی ساڵی ٢٠٠٧.

٤-یاسای پاراستنی کۆمەلایەتی ژمارە ١١ی ساڵی ٢٠١٤ کە لەو هۆکارانەی داوای دەرکردنی ئەم یاسایەیان کردبوو، بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی تاک و خێزانەکانی خوار هێلی هەژاری بوو، دروستکردنی سیستەمێکی هاوپشتی

خێزانـانه جێبەجـێ دەبێـت کە لەژێـر هێڵـی هەژاریـدان، جـا ئەوانە چ هاوڵاتی عێراقی بن یان هاووڵاتیانی وڵاتانی دیکەی نیشتەجێی کۆماری عێـراق بـن شـێوەیەکی هەمیشــەیی و بەردەوام، هاوکـاری پاراســتنی کۆمەڵایەتی لەم وڵاتانە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١ – کەمئەندام یان خاوەن پێداویستی تایبەت بێت.

٢ بێوەژن، جیابووەکە، هاوسەری ونبوو، قەیرە کچ، کچی عازەب.

٣ پەککەوتە

٤ هەتیوو.

٥ خێزانی زیندانیکراو یان دانراو لە پەنـاگە، ئەگەر سـزاکەی لە ساڵێک زیاتر بوو و بڕیارەکەشی بڕیارێکی کۆتایی بوو.

٦ سودمەندان خانەکانی دالدەدانی دەوڵەت.

٧ هەرزەکارانی سزادراو، کە ماوەی سزاکەیان لە ساڵێک زیـاترە و بڕیارەکەش کۆتاییە.

٨ خوێندکاری خێزاندارە تا قۆناغی ناوەندی.

٩ ئەو خێزانـانەی هـیچ داهاتێکیـان نییە یـان داهـاتەکەی لە خـوار ئاستی هێڵی هەژارییەوە بێت[1].

وەک بۆمـان دەردەکەوێـت، کە ئەم یاسـایە چەنـدین تـوێژی لەخـۆ گرتووە و ئامانجی پشتەوەی ئەو یاسایە گەیشتن بە ژیانێکی شایستە بـۆ ئەنـدامانی کۆمەڵگـا[2]. و ئـێمەش لە نێـو دەقەکانیـدا چەنـدین دەق دەدۆزێـتەوە کە ئامانجیـان گەرەنتیکردنـی کەرامەتـی تـاکە، لە یاسـاکەدا

---

کۆمەلایەتی و دامەزراندنی سیستەمی ئاسایشی کۆمەلایەتی بۆ غەیرە کرێکاران لە داهاتوودا".

١- بـڕوانە مـادەی ١/یەکەم لە یاسـای پاراسـتنی کـۆمەلایەتی ژمـارە ١١ی سـاڵی ٢٠١٤

٢- بڕوانە مادەی ٣/ژمارەی یاسای پاراستنی کۆمەلایەتی ژمارە ١١ی ساڵی ٢٠١٤

هاتووه: (دابینکردنی سەقامگیری دەروونی و ماددی بۆ تاک و خێزانەکانیان یان جێنشینەکانیان، دەستەبەرکردنی داهات بۆ تاک و خێزانەکانیان لە حاڵەتەکانی کەمئەندامی، پەککەوتەیی، پیری، مردن و لەدەستدانی توانای کارکردن، بە شێوەیەک کە ژیانێکی شایستە مسۆگەر بکات)[1]. بۆمان دەردەکەوێت کە یاسای پاراستنی کۆمەڵایەتی رۆڵێکی کاریگەری هەبووە لە باشترکردنی بارودۆخی ژیانی زۆرێک لەو خێزانانەی کە بەدەست نەبوونییەوە دەناڵێنن و بەشداریی کردووە لە بەرزکردنەوەی ئاستی داهاتەکانیان، بەتایبەتی کاتێک ئەو یارمەتییە نەختینەیانەی کە لەلایەن سودمەندانەوە وەرگیراون، هەموارکرانەوە، وەک یاساکە داوای کردووە بەرزترین ئاستی پاڵپشتی کۆمەڵایەتی بگاتە بڕی ٤٢٠ هەزار دینار بۆ هەر خێزانێک کە لە ٤ کەس و سەرووتر پێکهاتبێ، بەڵام ئەو هەموارکردنەی کە لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە بەسەر یاساکەدا کرا، کە لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی وەزیرانی ژمارە ٢٥٤ی ساڵی ٢٠١٦یە لە سی و شەشەمین دانیشتنی ئاسایی خۆیدا بەڕێوەچوو، لە ٢٠١٦/٢٧/٩ بەرزترین هاوکاری کۆمەڵایەتی هەموارکرایەوە. یارمەتییەکە بۆ تاکە خێزانێک کە لە ٤ کەس یان زیاتر پێکهاتبوو بوو بە ١٧٥ - سەد و حەفتا و پێنج هەزار دینار مانگانە، سەبارەت بە ژنانیش بڕی یارمەتییەکە بوو بە ٢٢٥ دوو سەد و بیست و پێنج هەزار دینار، بە پشتبەستن بە بڕگەکانی مادەی ٢٤ی یاسای پاراستنی کۆمەڵایەتی[2]، وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی لە ئێستادا ئەم یارمەتییانە بۆ سودمەندان جێبەجێ دەکات، بۆ ئەوەی

ش. س. م.

١- بڕوانە: مادەی /٣/ چوارەمی یاسای پاراستنی کۆمەڵایەتی ژمارە ١١ی ساڵی ٢٠١٤.

٢- بڕوانە: بڕیاری ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق، ژمارە ٢٥٤ی ساڵی ٢٠١٦، کە خشتەی سەقفی یارمەتییە کۆمەڵایەتییەکانی تێدایە.

ژیانێکی شایستەیان بۆ بەدەستبهێنێت، سەبارەت بە سوالکەران بۆمان دەردەکەوێت، کە وەزارەت بەشی سوالکردن و سەرگەردانی لە بەشی چاودێریی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان کردۆتەوە، لە بەغدا لە ساڵی ٢٠١٥، بەو پێیەی بە هەماهەنگی لەگەڵ لیژنە لاوەکییەکانی ناو پارێزگاکان کاردەکات بۆ کەمکردنەوەی دیاردەی سوالکردن، بە هەماهەنگی لەگەڵ لیژنە لاوەکییەکان کە دەکەونە ناو قایمقامیەتەکانەوە، لیژنەی لاوەکی پێکدێت لە ئەنجومەنی پارێزگا - بەڕێوەبەری پۆلیسی پارێزگا - فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنەکانی قایمقامیەت، فەرمانگەی مافی مرۆڤ و ئاسایشی نیشتمانی لە قایمقامیەت و بەڕێوەبەرانی چاودێری کۆمەلایەتی، تۆڕی پاراستن و چاودێریکردنی ئەو کەسانەی کە پێویستی تایبەتیان هەیە لە پارێزگا - بەشی تەندروستی پارێزگا و هەر لایەنێک کە پارێزگاکە بیەوێت بەشداری پێ بکات. بەشی سوالکردن لە وەزارەتدا هیچ دەسەلاتێکی جێبەجێکردنی نییە و تەنانەت سیستەمێکی ناوخۆیشی بۆ کارکردن نییە، بۆ بەدواداچوون بۆ ئەم دیاردەیە، بەشێکی ناچالاکە ڕوانگەی پراکتیکییەوە. سەرەڕای ئەوەش بۆمان دەردەکەوێت، کە چەندین هەنگاوی چارەسەری کە لەلایەن وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەلایەتییەوە دانراوە، لەوانە، بۆ نموونە، خستنەڕووی دروشمی (خێرخوازی بۆ کەمدەرامەتەکانە، ڕێگە مەدە سوالکەر دەستی بەسەرا بگرێت). وەزارەت درکی بە مەترسییەکانی ئەم دیاردەیە کرد، بۆیە هەلمەتێکی گەورەی هۆشیاریی دەرکرد، بەمەبەستی سنووردارکردنی ئەم دیاردە مەترسیدارە، تیمێکی کاری پێکهێنا کە پێکهاتبوو لە ژمارەیەک توێژەر، کە کارەکانیان سنووردارە بە چاوپێکەوتن لەگەڵ سوالکەر لە مەیدانەکەدا، لە کاتی پراکتیزەکردنی سوالکردن و بەلگەنامەدارکردنی ئەو کارە بە وێنەی ڤیدیۆیی و دابینکردنی کارتی بانگهێشتنامە بۆ سوالکەر و پابەندکردنی بە بەلێندان

که کاری سواڵکردن نەکات ، ئەگەرنا دەبێت بەرپرسیاریتی هەموو دەرئەنجامە یاساییەکان هەڵگرێت و مووچەی ئەو تۆڕەی پاراستنی کۆمەڵایەتی دەبڕێت، کە پێی دراوە[1]. وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی سندوقێکیشی بە ناوی (سندوقی پاڵپشتیکردنی پڕۆژە بچووکەکانی) هەیە، کە داهات تێدایە. کە کەسایەتییەکی یاسایی هەیە و لەلایەن وەزیری کار و کاروباری کۆمەڵایەتی یان نوێنەرایەتی دەکرێت[2]. ئەو سندوقەش بەپێی یاسای ژمارە ١٠ی ساڵی ٢٠١٢ دامەزراوە، بۆ پشتگیریکردنی پڕۆژە بچووکەکانی داهات، وەک یەکێک لە ئامانجەکانی "دەستەبەرکردنی هەلی کاری نوێ و کەمکردنەوەی بێکارییە[3]. ئەم یاسایە یارمەتیدەر بوو بۆ ئەوەی زۆرێک لە چین و توێژەکانی کۆمەڵگا بگرێتەوە و پاڵپشتیان بکات لە دانانی پڕۆژەی بچووک، کە لە ڕێگەیەوە بتوانن پێداویستییە سەرەتاییەکانیان دابین بکەن و ئاستی ژیانیان بەرز بکەنەوە، پسوولە وەک بنەمایەک بۆ دیاریکردنی یەک خێزان وەرگیراوە، وەزارەت قەرزی جێبەجێ کردووە لە چوارچێوەی ستراتیژی نیشتمانی بۆ کەمکردنەوەی هەژاری و لەنێو ئەو گروپانەی، کە بە وەرگرتنی قەرزەکە دەیانگرێتەوە، سواڵکەرانی خەڵکی پارێزگاکانن، نەک ئەوانی تر هێشتا، ئەو سواڵکەرانە دوای وەرگرتنی قەرزەکە بەڵێنیان داوە، کە هیچی دیکە سواڵ نەکەن. بەڵام نەمانبینی کە ژمارەیەکی زۆر لە سواڵکەران کە داوای ئەم قەرزە بکەن،

ش. س. م.

١- سەیری نووسراوی وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی ژمارە ٧٥ لە بەرواری ٢٠٠٧/١٥/١١ و بەڵێننامەی نووسراوی سواڵکەر بکە.

٢-بڕوانە: مادەی سێیەمی یەکەمی یاسای ژمارە ١٠ی ساڵی ٢٠١٢ سەبارەت بە پاڵپشتیکردنی داهات پڕۆژەی بچووک.

٣- ئەو بەڵگەنامانەی کە لە سواڵکەر دەخوازرێت لە کاتی پێشکەشکردنی قەرزەکەدا پێداچوونەوەیان بۆ دەکرێت.

بەهۆی نەتوانینی دابینکردنی گەرەنتی یان هێنانی گرێبەستی کرێ، کە لەلایەن دادنووسەوە پشتڕاستکرابێتەوە، بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە داواکارەکانمان نەبینی بۆ قەرزێک لە سوالکەران لە چوارچێوەی قەرزەکانی ستراتیژی نیشتمانی بۆ کەمکردنەوەی هەژاری، سودمەند بن.

دەوڵەت ئامانجێکی ڕوون و بەرزی لە هەڵگرتنەوەی ژمارەیەکی زۆر لە منداڵان و نەوجەوانان لە پەناگەکان و بەساڵاچووان لە خانەی بە ساڵاچووان هەیە[1]، چونکە دەوڵەت ڕۆڵی هەیە لەوەی منداڵان، گەنجان، و نەوجەوانان کە بەدەست حاڵەتەکانی هەڵوەشاندنەوەی خێزان یان لەدەستدانی کەسێکەوە دایک و باوک یان هەردووکیان دەناڵێنن، خانەیان لە کەشێکی باش بۆ دابین بکات[2]، هەروەها ماڵ بۆ بەساڵاچووانی لە سەرانسەری پارێزگاکانی عێراقدا هەیە، خزمەتگوزاری تەندروستی باشی تێدا هەبێت، هەروەها خانەی بە ساڵاچووان بۆ ئەوانەی نەخۆشییەکیان ئەگەرچی کەمیشە، بەلام کارێکی باشە[3]. بە هەمان شێوە لە ئێستادا وەزارەتی کار ڕێنمایی دەرکردووە کە ڕێگە بە منداڵە هەتیوەکانی تەمەن (١٨) هەژدە ساڵان دەدات، لەو خانانە بمێننەوە تاوەکو خوێندنی زانکۆ تەواو دەکەن، دەکرێت ئەو ماوەیە درێژ بکرێتەوە لە ئەگەری نەخۆشیدا بە بڕیاری یەکێک لیژنەیەکی پزیشکی فەرمی شوێنی داڵدەدان[4]، بەهەمان شێوە، "دەتوانرێت چاودێریی

ش. س. م.

١- بۆ زانیاری زیاتر: بڕوانە: یاسای ژمارە ٥ی ساڵی ١٩٨٦ یاسای ڕۆڵی دەوڵەت.

٢- بڕوانە: مادەی ٢ لە یاسای ژمارە ٥ی ساڵی ١٩٨٦ سەبارەت بە ڕۆڵی دەوڵەت.

٣- بۆ زانیاری زیاتر، سەیری: ڕێنمایی ژمارە ٤ی خانەی بەساڵاچووان بکەن لە ساڵی ١٩٨٥.

٤-ڕوانە مادەی ٢/یەکەم لە ڕێنماییەکانی ژمارە ١٥ی ساڵی ٢٠١٦، هەموارکراوی چوارەم بۆ ڕێنماییەکانی ڕۆڵی دەوڵەت ژمارە ٥ی ساڵی ١٩٩٤، کە لە (الوقائیع)

سـودمەندی ژن لە خـانەی دەوڵەت درێـژ بکـرێتەوە، تـا ئەو کـاتەی کە پەناگەیەکی گونجاو بەدەست دەهێنێت، یـان هاوسـەرگیری دەکات، یـان دەرفەتـی کـارێکی گونجـاو بەدەسـت دەهێنێـت، هەروەهـا دەکرێـت لە ئەگەری نەخۆشـیدا درێـژ بکـرێتەوە بە بڕیـاری لیژنەیەکـی پزیشـکی پسپۆڕ[1]. ئامانجی پشت کردنەوەی خانەی چاودێری بۆ منداڵە هەتیوە پێگەیشـتووەکان، پاراسـتنی ژیانیـان و نەقۆسـتنەوەیانە لەلایەن بانـدە تاوانکارییەکان بۆ ئەنجامدانی کردەوەی تاوانکاری یان کاری نائەخلاقی یان لەلایەن کەسانی لاوازەوە ناچار بکرێن بۆ سواڵکردن. وەزیری کار و کاروباری کۆمەلایەتی ڕێنمایی دەرکرد، کە خـانەی داڵدەدان هەمـوو پارێزگاکـان بـۆ ڕاکێشـانی منـداڵە هەتیوەکـانی پێگەیشـتوو بکـرێتەوە بە مەبەستی پاراستنیان، وەزارەتەکە نامەیەشی بۆ وەزارەتی نـاوخۆ نـارد، کە بەرەنگـاری دیـاردەی سـواڵکردنی بیـانی ببێـتەوە و کۆنترۆڵ هـاتنی بیانی بکات، جەختکردنەوە لەسـەر کـاری لیژنە لاوەکییەکـانی بەرپرسـی بەرەنگــاربوونەوەی ســواڵکردن و ســەرگەردانی لە پارێزگاکــان بە هاوکـاری و هەمـاهەنگی لەگەڵ لایەنە پەیوەندیـدارەکان، جەختکـردنەوە لەسەر پێکهێنانی دەوریەی هاوبەش لە زۆربەی پارێزگاکان تاکو لەسەر مەزارگە پیرۆزەکـان بوەسـتن و ڕێگری لە هەمـوو جۆرە سـواڵکردنێک بکەن، هەروەها لە هەرێمی کوردسـتان ـ عێراق لە هەمـوو شـارەکان، بە تـایبەتی لە هەولێـری پایتەخـت، بەرێـوەبەرایەتی پۆلیسـی ڕێککـاری

---

بڵاوکراوەتەوە، ژمارە ٤٤٢٦ لە ٢٠١٦/٥/١٢، و نووسراوی وەزارەتی کار ، ڕۆڵی وەزارەتـی دەرەوە ژمــارە ١٣١٨ لە ٢٠١٧/١٢/٩، بـۆ ســەرجەم پارێزگــارە نارێکخراوەکان.لە هەرێمێکدا، کە بریتییە لە کردنەوەی خانە بۆ چاودێریکردنی منداڵە هەتیوە پێگەیشتووەکان، بە مەبەستی چارەسـەرکردنی حاڵەتە مرۆییەکان و ئیستغلال نەکردنیان.

١-ڕوانە: مادەی ٢/دووەمی ڕێنمایی ژمارە ١٥ی ساڵی ٢٠١٦.

لیــژنەیەک هەیە، کە پێکهــاتووە لە نــوێنەرایەتی قائیمقــام و پــۆلیس و ئاســایش و پاریزگــا، بەردەوام لە هەوڵــدان بــۆ کەمکــردنەوەی دیــادەی سواڵکردن، لە هەموو شــارو شــارۆچکەکانی هەرێم، بەمەبەســتی دانــانی ســنوورێک بــۆ دیــاردەی ســواڵکردن بە هەمــاهەنگی نــوێنەری وەزارەتە پەیوەندیــدارەکانی نــاوەخۆ و کاروبــاری کــۆمەڵایەتی. دولە بەشــەکانی داهاتوو داتایەک دادەنێین، کە پێشتر بڵاو نەکراوەتەوە، لەلایەن پۆلیسی رێککاری بە سوپاسەوە پێمان دراوە.

## لقی دووەم
## ئامرازەکانی چارەسەری تاوانی سواڵکردن لەلایەن وەزارەتی ناوەخۆوە

وەزارەتی ناوەخۆ رۆڵێکی گەورە لە بەرەنگاربوونەوەی نەهێشتنی سواڵکردن دەگێڕێ، لەلایەک بەهۆی ئەوەی ئەو وەزارەت دەتوانێ یاسا بســەپێنێ و ئــامرازانەی دەیگــرێتەبەر، لەلایەکــی دیکەشــەوە لە پێنــاو پاراستنی ئارامی کۆمەڵایەتی و ئاستی هاوڵاتیان.

وەزارەتی ناوخۆ لە عێراق ڕۆڵی گەورەی هەیە، بەو پێیەی دەزگای جێبەجێکردنە، کە ڕۆڵی هەیە لە جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانەی کە لەلایەن دادگاکــانەوە دەردەچــن، پۆلیسەکانیشــی بە ئەنــدامی پۆلیســی دادوەری دادەنرێــت[1]، پۆلیســەکان بنەمــای پاراســتنی ئاسایشــن و ســەقامگیری لە کۆمەڵگــادا، و ڕۆڵێکــی ڕوونیــان هەیە لە مــامەڵەکردن لەگەڵ تــاوانی ســــواڵکردن و لە ڕێــگەی ئەو میکانیزمــانەی کە وەزارەت پەســەندی

ش. س. م.

١- بڕوانە: مادەی ١/٣٩ لە (قانون أصول المحاكمات الجزائية العراقي) كە دەڵێت: ئەنــدامانی ڕێكخســتنی دادگەری ئەم كەســانەن لە بوارەكــانی كارامەییــدا: ١- ئەفسەری پۆلیس، مەئموری مەركەز، و مفەوەزەكانن".

کردووە، وەک چۆن ڕێنمایی پێکهێنانی تیمی مەیدانی بە هەماهەنگی لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکان بۆ چارەسەرکردنی دیاردەی سواڵکردن دەکەن، ئەو سواڵکەرانە دەستگیردەکەن و دەیدەنە دادگا، بەو پێیەی دیاردەی سواڵکردن کاریگەری نەرێنی هەیە و کۆمەڵگا تووشی ئازار دەکات. سەرەڕای ڕێنماییەکانی وەزارەتی ناوخۆ بۆ پێکهێنانی تیمی مەیدانی، بڵاوبوونەوەی بەرفراوانی دیاردەی سواڵکردن لەبەردەم گۆڕەپانەکان و ترافیک لایتەکان و لەبەردەم چاوی پیاوانی کۆنترۆڵی دادوەریی لە فریاکەوتن و پۆلیس و هاتوچۆوە، دەبینین ئەو پیاوانەی دەوڵەت هیچ خۆیان تێکنادەن، وەک ئەوەی بەزەییان بە بارودۆخەکەیاندا بێتەوە و دەستگیریان ناکەن، بەتایبەتی ژنان و منداڵ و بەساڵاچووان، بۆیە داوا لە جەنابی وەزیری ناوخۆ دەکەین بۆ ئەوەی جەخت لەسەر ئەو تیمانە بکاتەوە، کە هەنگاوی پتەوی تێدا بگرنەبەر، فەرمانی دەستگیرکردنی هەموو سواڵکەرەکان بدەن، هەروەها وەزارەتی ناوخۆ پێشنیاری پێکهێنانی لیژنەی لاوەکی لە سەرجەم پارێزگاکان کرد، بەمەبەستی نەهێشتنی دیاردەی سواڵکردن و ناردنی ئەوانەی دەستگیرکراون بۆ دادگای تایبەتمەندەکان، ئەم لیژنە لاوەکییانە پابەندن بە دەرکردنی ڕاسپاردە و پێشکەشکردنیان بۆ دەسەڵاتە باڵاکان بە مەبەستی خستنەڕووی پێشنیارەکان بۆ چارەسەرکردن و پەرەپێدانی پلان و بەرنامە بۆ چارەسەرکردنی دیاردەی سواڵکردن، بەپێی یاسا و ڕێنماییەکان. دواتر زانیاری تەواو بە وەزارەتی ناوخۆ و نووسینگەی بەڕێز وەزیر لەبارەی ڕاسپاردە و ڕێوشوێنە وەرگیراوە.

سەرەڕای لیژنە هاوبەشەکان، سواڵکەرێکی زۆر دەبینین، ئەم دیاردەیە سنووردار نەبوو، کۆبوونەوەکان زیاتر تیۆری بوون، نەک پراکتیکی لە کەمکردنەوەی ئەم دیاردەیە، جگە لەوەش چاودێری کۆمەڵایەتی بووەتە بەشی پاراستنی کۆمەڵایەتی، بەپێی یاسای

پاراستنی کۆمەڵایەتی ژمارە ١١ی ساڵی ٢٠١٤، و لیژنەی هاوبەشیش پێویستە تێبینی ئەوە بکات. هەروەها وەزارەت چەندین ڕێکاری دیکەی گرتەبەر بۆ کەمکردنەوەی دیاردەی سواڵکردن، لەوانە ئەنجامدانی وۆرک شۆپ لە دیوانی وەزیر بە ئامادەبوونی ئەفسەرانی جێبەجێکردن و پەراوێزی وەزیر و ڕوونکردنەوە لەسەر هۆکاری بوونی سواڵکەری بیانی و پێکهێنانی تیمی مەیدانی هاوبەش لەگەڵ وەزارەتی داد و وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی بۆ کەمکردنەوەی دیاردەی سواڵکردن و چاودێریکردنی هاتووان بۆ ناو وڵات. وەزارەت پابەند بوو بە دۆزینەوەی شوێنی تایبەت بۆ دەستگیرکردنی سواڵکەر و بێلانەکان، وەک لە پارێزگای بەغدا، بەڕێوبەرایەتی پۆلیسی بەغدا بنکەی پۆلیسی ئەلسەلام و قاهیرەی تەرخانکرد، داواش لە سەرجەم بەڕێوەبەرایەتییەکان دەکات شوێنی تایبەت بۆ سواڵکەران بدۆزنەوە بۆ دەستگیرکردنیان ، بۆ ئەوەی تێکەڵ بە تاوانباران نەبن.

سەرەڕای ئەوەی پۆلیس ڕێکارەکانیان لە دەستگیرکردنی سواڵکەرەکاندا جێبەجێ دەکەن، بۆمان دەردەکەوێت کە دەسەڵاتی دادوەری دەستبەجێ ئازادیان دەکات، یان دەسەڵاتی دادوەری پەنا دەباتە بەر وەرگرتنی بارودۆخ و بیانوو بۆ ئەوەی سزایان بەسەردا نەسەپێنێت، وەک بەدیار دەردەکەوێت، کە هاوسۆزی و لێبووردەیی لەلایەن دەسەڵاتی دادوەرییەوە ڕۆڵێکی ڕوونی هەیە لە ئازادکردنیان[1]،

ش. س. م.

١- بڕوانە: بڕیاری دادگای تاوانەکانی نەجەف لە دۆسیەی ژمارە ٢٠١٧/٢/٢٣ ٢٠١٧/٦٣٦، کە بڕیتییە لە غەرامەکردنی بە بڕی پەنجا و یەک هەزار دینار بە پشتبەستن بە برگەکانی ماددەی ٣٩٠ لە یاسای سزادانی عێراقی و وەک بەڵگەی مادەکان ١٣١ و ١٣٣ لە یاسای سزادان و لێبڕینی بڕی پەنجا و یەک هەزار بۆ هەر ڕۆژێک کە سزادراوەکە لە دەستبەسەرکردندا خەرجی کردووە، و لە ئەگەری نەدانی پارەدا، بۆ ماوەی یەک مانگ زیندانی دەکرێت.

هەروەها بۆمان دەردەکەوێت، کە زۆربەی سواڵکەرەکان، کاتێک لەلایەن پۆلیسەکانەوە دەبرێنە دادگاکانی تایبەتمەندەکان ئازاد دەکرێن و لێکۆڵینەوەکە دادەخرێت، چونکە زۆربەی سواڵکەران تاوانی سواڵکردن رەتدەکەنەوە و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بوونیان لەسەر رێگا گشتییەکان و لەبەردەم ترافیک لایتەکان بۆ فرۆشتنی هەندێک کەرەستەی وەکو کلینکس بووە، هەر بۆیە ئەم کارە لەلایەن یاسادانەرەوە بە تاوان دانانرێت، تەنانەت ئەگەر بەڵگەکان روونیش بن کە ئەمانە سواڵکەرن، هەر بۆیە دادگاکانی لێکۆڵینەوە تۆمەتبار ئازاد دەکەن و بڕیار دەدەن لێکۆڵینەوەکە دابخەن و سکاڵاکە رەت بکەنەوە، یان بڕیار دەدەن لێکۆڵینەوەکە دابخرێت، چونکە تۆمەتبار ئەو تاوانە رەتکر دەکاتەوە کە رووبەرووی کراوەتەوە، یاسادانەری عێراق ئەو کەسانە بە تاوانبار نازانێت، کە شتی سادە یان بێ بایەخ دەفرۆشن، تەنانەت ئەگەر بەڵگەکان پشتڕاستی بکەنەوە، کە سواڵکردن پراکتیزە دەکات، بۆیە داوا لە یاسادانەر دەکەین فرۆشتنی شتە بێ بایەخەکان بە تاوان بزانن، ئەگەر دەسەڵاتی کەسەکە بۆ دەسەڵاتی دادوەری ئاماژە بەوە بکات و دادگاش قەناعەتی بەو شتە هەبێت، کە مەبەستەکە سواڵکردنە، داوا لە یاسادانەر دەکەین چارەسەری ئەم کەموکوڕییە بکات و رێگە نەدات سواڵکەرەکان بە کارەکانیان و بەردەوامی سواڵکردنیان رزگاریان بێت. بۆیە داوا لە دەسەڵاتی دادوەری دەکەین بە توندی سزای سواڵکەرەکان بدات، بۆ ئەوەی بتوانێت یاسای کەمکردنەوەی دیاردەی سواڵکردن جێبەجێ بکات، سەبارەت بە پۆلیسی

---

پاش سەردانیکردنمان و بەدواداچوونمان لە دادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر، هەموو سواڵکەرەکان پاش ئەوەی دەستگیر دەکرێن دادوەر بە غەرامەی ٤٥٠٠٠ چل و پێنج هەزار دینار ئازادیان دەکات، وەکو یارمەتی و هاوسۆزی بۆ سواڵکەر، چەندین حاڵەتی لەم شێوەیەمان لەداداگان بینیووە.

نەوجەوانان ئەرکەکانیان بە یاسای چاودێری نەوجەوانان ژمارە ٧٦ی ساڵی ١٩٨٣ دیاری کراوە، ڕێژەکە لەوەدایە کە پۆلیسی نەوجەوانان بەدوای گەنجە ونبووەکان و ئەوانەی لە خێزانەکانیان هەڵدێن و پشتگوێخراوەکان دەگەڕێن، ئەو نەوجەوانانە دەستنیشان دەکات کە مەترسی تاوانکارییان لەسەرە، لەو شوێنانەی کە نەوجەوانان بۆ خۆیان ڕادەکێشن، وەک کافێ و باڕ و سینەماکان لە درەنگانی شەودا[1]. بوونیان لەو شوێنانە نەوجەوان تووشی تاوان کەتن دەکات، ئەمەش بەپێی بڕگەکانی مادەی ٢٣ی هەمان یاسا، باوانیان بەپرس دەکات، هەروەها لە ئەرکەکانی پۆلیسی نەوجەوانان ئەوەیە کە نەوجەوانەکە بهێنرێتە بەردەم دادگای نەوجەوانان یان دادوەری لێکۆڵینەوە[2].

ش. س. م.

---

١- بڕوانە: مادەی ٢٣ لە یاسای چاودێری نەوجەوانانی عێراقی ژمارە ٧٦ی ساڵی ١٩٨٣ هەموارکراو.

٢- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مادەی ٤٨ی هەمان یاسا.

# رۆڵی پۆلیسی ڕێککاری لە هەرێمی کوردستان
# لە بەرگرتن بە دیاردەی سواڵکردن
# شاری هەولێر بە نموونە

شـــاری هەولێـــر، وەک پـــایتەختی هەرێمـــی کوردســـتانی عێـــراق، گەورەتـــرین کۆبـــوونەوەی خەڵکـــی، کـــۆنترین شـــارەکە لە رۆژهەڵاتـــی ناوەراسـت، ئەمەش وایکردووە، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەم شـارە تونـــدتر دەربـــکەون لەچـــاو شـــارەکانی دیـــکە، لەلایەکـــی دیکەشـــەوە دانیشـتوانی ئەم شـارە لە رووی داب و نەریـت پارێزگـارە و لەرووی ئاینییەشەوە پابەندییەکی ئایینی زۆریان هەیە، هەموو خەسڵەتانەش وای لە ســـواڵکەرانی خۆمـــاڵی و بیـــانی کـــردووە، روو لەم شـــارە بـــکەن، ژمارەکەی ساڵ لەدوای ساڵ زیاد بکات.

بە گـــوێرەی تـــوێژینەوەیەک کە لە ســـاڵەکانی ٢٠٢١ تـــاکو ٢٠٢٢ ئەنجامدراوە[١]، سواڵکەرانی شـاری هەولێری بە نمـوونە وەرگرتـووە، کە لەســـەر دوو ئاســـتی دوو گـــۆڕاو کـــاری لەســـەر دیـــاردەی ســـواڵکردن کردووە، ئەوانیش گۆڕاوی تەمەن و گۆڕاوی وەرزەکان.

یەکەم: رۆڵـــی گـــۆراوی تەمەن لە دیـــاردەی ســـواڵکردن لە شـــاری هەولێر

---

ش. س. م.

١- موقەدەم شوان سعدی عمر، توێژینەوەیەکی شیکاری بۆ دیاردەی سـواڵکردن لە شـــاری هەولێـــر، بە مەبەســـتی پـــلە بەرزکـــردنەوە لە ســـاڵی ٢٠٢٢ پێشکەشـــی وەزارەتی ناوەخۆی کردووە.

**خشتەی ژمارە (١) دیاردەی سواڵکردن لە شاری هەولێر، بەپێی تەمەنی سواڵکەرەکە**

| ساڵ/تەمەن | سەرووی ١٨ساڵ | ڕێژە | خوار ١٨ساڵ | ڕێژە | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠١٨ | ٤٥٢ | ٤٥,٨ | ٥٤٣ | ٥٤,٢ | ٩٩٥ |
| ٢٠١٩ | ٤٧٧ | ٤٥,٥ | ٥٧١ | ٥٤,٥ | ١٠٤٨ |
| ٢٠٢٠ | ٣٤٠ | ٤٦,٦ | ٣٨٩ | ٥٣,٤ | ٧٢٩ |
| ٢٠٢١ | ٥٢٥ | ٤٥,٣ | ٦٣٥ | ٥٤,٧ | ١١٦٠ |

لەخشتەی ژمارە (١)دا دەردەکەوێ کەساڵانە ڕێژەی سواڵکەر لەهەولێر روو لەزیاد بوونە، بە شێوەیەک جیاوازی نێوان ساڵی ٢٠١٨ بو ساڵی ٢٠٢١ بریتیە لە (١٧٤) سوالکەر، ئەگەر سەرنج بدەین ئەوا تێبینی ئەوە دەکرێ کە زیاد بوونی ژمارەی ساڵانە بە ڕێژەیەکی دیاریکراو لە کوی گشتی بریتیە لە نزیکەی (٥٠) بو (٦٠) سواڵکەر بو هەر سالیک، بەرای توێژەر هۆکاری ئەو بەرزبوونەوەی ڕێژەی سواڵکەرەش بۆ سەختی و نالەباری گوزەران لە ساڵی (٢٠٢٠) دەگەڕێتەوە کە بەهوی بوونی پەتای کورۆنا و بێکاری تووشی هاولاتیان بە گشتی بووەوە، وەک دەردەکەوێ کەوا چەندی ڕەوشی ئابووری خراپ بێت، ئەوەندە ڕێژەی سواڵکردن کەم دەبێتەوە، بە پێچەوانەشەوە، چەندی خەڵکی بەگشتی پارەیان بێتە دەست و دەوڵەمەند بن، ئەوەندە ئارەزوویان بۆ خێرکردن زیاتر دەبێت، ئەوەش وا دەکات ڕێژەی سواڵکەر زیاتر بکات.کەواتە هەرچەندە کاریگەری قەیرانی دارایی روو لەکەمبوون بیت، ئەوا ڕیژەی سوالکردن زیاد دەبیت ،بەپێی ئاماری سوالکەرانی پولیسی ڕێککاری هەولێر وەک لە خشتەکەدا خراوەتەروو.

هەروەهــا بەســەرنج دان لەهەمــان خشــتەی دەردەکەوێ، کە بــۆ هەرچــوار ســاڵی یەک بەدوای یەک کە بــریتین لە ســاڵانی (٢٠١٨ و ٢٠١٩ و ٢٠٢٠ و ٢٠٢١) دەبینــین رێــژەی ســەدی ئەو کەســانەی کە تەمەنیان لە سەرووی (١٨) ساڵە بەراورد بکەین بەوانەی تەمەنیان لە خــوار (١٨) ســاڵیەوەیە، دەبێــین بە رێــژەی (١٠%) تەمەن بچووکەکــان زیــاترن لە تەمەن گەورەکــان، ئەمەش دەرخەری ئەوەیە، کە منــاڵان بــۆ ئەنجامــدانی ســواڵکردن ناچــارکراون لەلایەن گەورەکانیــان یــان لەلایەن بانــد و رێکخراوەکــانەوە، لەوانەیە رێــژەیەکیش بەهــۆی خراپــی بــاری ئابوورییەوە روویان لەم کاری سواڵکردنە کردبێت.

دووەم: رۆڵــی گــۆڕاوی وەرز لە دیــاردەی ســواڵکردن لە شــاری هەولێر

خشــتەی ژمــارە (٢) دیــاردەی ســواڵکردن لە شــاری هەولێر، بەپێی وەرزەکان

| ساڵ/وەرز | بەهار | ڕێژە | هاوین | ڕێژە | پایز | ڕێژە | زستان | ڕێژە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠١٨ | ٣٥١ | ٣٥,٦ | ١٥٣ | ١٥,٥ | ٣٠٦ | ٣١ | ١٧٦ | ١٧,٨ |
| ٢٠١٩ | ٣٦٦ | ٣٤,٩ | ١٧٧ | ١٦,٩ | ٣١٧ | ٣٠,٢ | ١٨٨ | ١٧,٩ |
| ٢٠٢٠ | ١٥ | ٢,١ | ١٧٦ | ٢٤,١ | ٣٣٧ | ٤٦,٢ | ٢٠١ | ٢٧,٦ |
| ٢٠٢١ | ٤٥٦ | ٣٩,٣ | ١٥٨ | ١٣,٦ | ٣٤٠ | ٢٩,٣ | ٢٠٦ | ١٧,٨ |

لە خشتەی ژمارە (٢) دا بۆمـان دەردەکەوێ کە لـە شـاری هەولیر سوالکەران سوود لە گورانی کەش و هەواو بونە نەتەوەیی و ئاینیەکان وەردەگـرن بـۆ ئەنجامـدانی کـاری ســواڵکردن، کــە تێیــدا دەردەکەوێ هەردوو و وەرزی بەهار و پاییز یەک لەدوای یەک دیاردەی سوالکردن

تیایاندا زۆرترە لەو وەرزەکانی هاوین و زستان کە ڕێژکە تیایاندا (٣٦) و (٣١%) یەک لەدوای یەک لەبەرامبەردا ڕێژەی سواڵکەران لە هەردوو وەرزی هاوین و زستان کەمبوتەوە بو (١٨) و (١٥)، ئەمەش، دەتوانین وا لێکی بدەینەوە، کە گۆڕانی کەش و هەوا کاریگەری لەسەر زۆربوون و کەمبوونەوەی ژمارەی سواڵکەران هەیە، بە جورێک، دەبینین هەردوو وەرزەکانی بەهار و پایز ڕێژەی سواڵکەر زیاد بوونە، بە هوی بوونی چەند هوکارێکی دیاریکراو لە وانە: خۆشی باری کەش و هەوا لەم دوو وەرزە، کە وا دەکات سواڵکەرەکان بتوانن، بۆماوەیەکی زۆرتر لەسەر شەقامەکان و شوێنە گشتییەکان بمێننەوە، بەبێ ئەوەی پێویستیان بە ئامێری فێنکەرەوە یان شوێنی داڵدەدان هەبێت، هەروەها یەکێکی دیکە لەو هۆکارانە بوونی چەندین بۆنەی نەتەوەیی و ئاینییە، کە ئەمەش وادەکات ژمارەیەکی زۆر خەڵک بەدەرەوە بن و گروپ گروپ لە شونەکان کۆببنەوە و مەراسیم و ڕێورەسمە تایبەتەکان بەرێ بکەن، ئەمەش لەلایەن سواڵکەرەکان دەقۆزرێتەوە تاکو کاری سواڵکردنی تێدا بکەن، بەتایبەت لە بۆنە ئاینیەکان کە خەڵکی زیاتر بۆ خێرکردن دەست کراوە دەبن. هەروەها تێبینی ئەوە دەکەین کە وەرزەکانی پایز و زستان ڕێژەی سواڵکەری تێیدا کەم دەبێتەوە، بەهۆی ساردی و تەڕو تووشی شوێنە گشتییەکان لەلایەک، لەلایەکی دیکەوە کۆبوونەوەی جەماوەری و خەڵک و ئاهەنگەکانیش لەدەرەوە ناکرێن، کەوا دەکات سواڵکەرەکان بێ بازار بن.

ئەوەی لەم خشتەیە دەبێتە مایە پرسیار ئەوەیە، ئەویش کەمی ڕێژەی سواڵکردن لە ساڵی ٢٠٢٠ کە بوتە (٢.١) ئەوەش بو ئەوە دەگەڕێتەوە لەو ساڵەدا و لەسەرەتای وەرزی بەهار بڕیاری ڕاگەیاندنی کەرەنتین درا، بەهۆی بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی کۆرۆناوە، ئەمەش وایکرد بازارەکان بە داخراوی بمێننەوە و خەڵکی بۆ کارێکی زۆر گرنگ نەبووایە هاموشۆی شوێنە گشتییەکانیان نەدەکرد، بەمەش سواڵکەرەکانیش کەسێکی وایان دەست نەدەکەوت تا داوای پارەی لێ بکەن.

## سێیەم: دەستگیرکردنی سواڵکەر و دەستگێر بە پێی تەمەن لە ماوەی دوو ساڵدا

بە گوێرەی ئامارێکی نافەرمی کە لە ماوەی ساڵی و نیوێک کراوە، لەلایەن پۆلیسی رێککاری، وەک هەڵمەتی دەستگیرکردنی سواڵکەر لە شوێنە گشتییەکان لەناو شاری هەولێر (نەوەک پارێزگا) دەرکەوتوو ژمارەیەکی زۆر سواڵکەر هەیە و ئەو ژمارەیەش ساڵ دوای ساڵ زیاد دەکات.

بەرێوەبەرایەتی بەشی پۆلیسی رێککاری لە شاری هەولێر لە ئامارێکی نا فەرمیدا[1]، کە لە ماوەی (٢٠٢٢/١/١) بۆ (٢٠٢٢/١٢/٥) بەرێوەبەرایەتییەکەیان لە هەڵمەتی دەستگیرکردنی سواڵکەر و دەستگیری تەمەنی سەرووی (١٨) ساڵ، نزیکەی ١٧٠ سواڵکەر و دەستگێریان دەستگیرکردووە، بۆ تەمەنی خوار (١٨) ساڵیش ١٤٥ کەسیان گرتووە وەک لەم خشتەیە دیارە:

| | | |
|---|---|---|
| دەستگیرکردنی سوالکەر و دەستگێر لە چوارلایانەکان سەرووی تەمەنی ١٨ ساڵ و کردنەوەی پەڕاوی لێکۆڵینەوە بۆ کراوەتەوە | ١٧٠ سواڵکەر و دەستگێر | لە رێکەوتی (٢٠٢٢/١/١) بۆ (٢٠٢٢/١٢/٥) |
| دەستگیرکردنی سواڵکەر و دەستگێر چوارلایانەکان خوار تەمەنی ١٨ ساڵ و کردنەوەی پەڕاوی لێکۆڵینەوە بۆ کراوەتەوە | ١٤٥ سواڵکەر و دەستگێر | لە رێکەوتی (٢٠٢٢/١/١) بۆ (٢٠٢٢/١٢/٥) |
| کۆی گشتی | ٣١٥ کەس | |

ش. س. م.

١- بەرێوەبەرایەتی پۆلیسی رێککاری شاری هەولێر، ئاماری رۆژانی ٢٠٢٢/١٢/٥ و ٢٠٢٣/٦/١٢. لێرەدا زۆر سوپاسی بەڕێز موقەدەمی پۆلیس شوان سعدی عمر بکەم، کە هاوکاری زۆری کردین بۆ بەدەستهێنانی ئەم ئامارانە.

وەک دیارە پۆلیسی رێککار دەستگیرپیشی لە تەمەنی بچووک و گەورەی وەک سوالکەر هەژمارکردووە، بەهۆی ئەوەی ئەو شتانەی دەیفرۆشن شتی بێ بەها و ناپێویستن، بۆئەوە بووە کردەی سوالکەرییەکەیان رەوایەتی پێ بدەن. بۆیە جیاوازی لەنێوان نەکردووە و پەراوی لێکۆڵینەوەی بۆ هەردووکیان کردۆتەوە.

ئەگەر سەیری ئاماژی ساڵی دواتر، واتا شەش مانگی ساڵی ٢٠٢٣ بکەین، دەبینین ژمارەی رێک دوو هێندە بۆتەوە، هەمان بەرێوەبەرایەتی پۆلیسی رێککاری لە ئامارێکی دیکەدا، کە لە ماوەی شەش مانگ ئەنجامی داوە، دەرکەوتووە کە پۆلیسەکانیان ژمارەیەکی زۆرتر لەوەی ساڵی رابردوویان دەستگیرکردووە، ئەمەش نیشانەی ئەوەی ژمارەکە ساڵ لەدوای ساڵ روو لە هەڵکشانە، وەک لەم خشتەی خوارەوە دیارە.

| | | |
|---|---|---|
| دەستگیرکردنی سوالکەر و دەستگێڕ لە چوارلایانەکان سەرووی تەمەنی ١٨ ساڵ و کردنەوەی پەراوی لێکۆڵینەوە بۆ کراوەتەوە | ٢٣٣ سوالکەر و دەستگێڕ | لە رێکەوتی (٢٠٢٣/١/١) بۆ (٢٠٢٣/٦/١٢) |
| دەستگیرکردنی سوالکەر و دەستگێڕ چوارلایانەکان خوار تەمەنی ١٨ ساڵ و کردنەوەی پەراوی لێکۆڵینەوە بۆ کراوەتەوە | ١٣١ سوالکەر و دەستگێڕ | لە رێکەوتی (٢٠٢٣/١/١) بۆ (٢٠٢٣/٦/١٢) |
| کۆی گشتی | ٤٥٣ کەس | |

وەک لە خشتەکە دیارە، پارەکە لەماوەی ١٢ مانگ تەنها ١٧٠ سوالکەر و دەستگێری سەرووی تەمەنی ١٨ ساڵ گیراوە، کەچی

ئەمساڵ ژمارە بۆتە ٣٢٢، ئەمەش نیشانەیەکی دیارە کە دیاردەی سواڵکردن لەم شارە روو لە هەڵکشانە، پێویستە لەسەر دەسەڵاتداران رێوشوێنی جدیتر بگرنەبەر و دەزگاکانی دیکەی مەدەنی و خێرخوازی لە بەرگرتن بەم دیاردە بەشداری پێ بکەن، هەروەها لە بەراوردکردنی هەردوو خشتەکە بۆمان دەردەکەوێت ژێژەیەکی زۆر مناڵ کەوتوونەتە سەرجادەکان کە نیوە گەورەکانن، بەلام لە ساڵی ٢٠٢٣ دەبینین ژمارەی مناڵە دەستگیرکراوەکان هەندێک کەمی کردووە.

بەڵام لە ئامارەی بەرێوەبەرایەتی پۆلیسی رێککاری زانیاری زیاتر نەهاتووە، لەبارەی ئەوەی ئاخۆ ئەوانە جاری چەندەمیان لەسەر کاری سواڵکەری دەستگیرکراون.

ماوەتەوە زۆر سوپاسی بەرێز موقەدەمی پۆلیس شوان عومەر محەمەد بکەم، لە بەدەستهێنانی ئەم داتایانە لەشاری هەولێر زۆر هاوکاریکردم.

## کۆتایی

دوای تەواوبوون و کۆتایی هاتنی ئەم توێژینەوەیە، گەیشتینە چەند دەرەنجامێک و کۆمەڵێک راسپاردەمان بۆ لایەنی پەیوەندیدار کردووە، تاکو سوودی لێ ببینن

**یەکەم: دەرەنجامەکان**

١- تاوانی سوالکردن یەکێکە لە تاوانە مەبەستدارەکان و بە دیاردەیەکی جیهانی دادەنرێت، سەرەڕای جیاوازی سروشتی لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر، بەو پێیەی کاریگەری لەسەر سەلیقەی گشتی هەیە و لە زۆربەی یاساکاندا پێناسە نەکراوە بە یاسادانەری عێراقیشەوە.

٢- یاسادانەری عێراق سوالکردنی شاراوەی بە تاوان نەزانیووە، کە بریتییە لە فرۆشتنی کەلوپەلی بێ بایەخ وەک شانە یان ئاو یان چەند شتی دیکە.

٣- تاوانی سوالکردن یەکێکە لە تاوانە ئەرێنییەکان، بەو پێیەی سوالکردن وا دەرناکەوێت کە بوونی هەبێت، مەگەر بە کردەوەیەکی جەستەیی، کە ئەنجامدەرەکەی ئەنجامی بدات.

٤- یاسادانەر، سوالکردنی بە تاوان زانی، بۆ پاراستنی سەلیقەی گشتی و پاراستنی هەستی هاوولاتیان و زیانیان پێنەگەیاندن لەلایەن سوالکەرەوە و پاراستنی کەرامەتی سوالکەر و بەفیڕۆنەدانی ئەو کەرامەتەی.

٥- تاوانی سوالکردن پێشێلکارییە لە یاساکانی عێراقدا بە پشتبەستن بە بڕگەکانی ماددەی ١/٣٩٠ لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراو.

٦- دەستپێکردن لە تاوانی سواڵکردن ڕوونادات، چونکە سەرپێچییە و تاوانێکی فەرمییە، بەو پێیەی ئەنجامەکەی بەدەست دێت.

٧- یاسادانەر بوونی نیەتی لە تاوانی سواڵکردن ئاشکرا کرد، چونکە ویستی سزای تاوانەکە لە تاوانەکانی سەرپێچیەکانی تر قورستر بکاتەوە، هەروەها مەرجی هەبوونی نیەتی تایبەتی نەخستەڕوو، بەڵکو بوونی نیەتی گشتی، لەسەر بنەمای لە برگەکانی ماددەی ٣٩٠/١ لە یاسای سزادانی عێراقی، کە تێیدا هاتووە، بوونی سواڵکەر بە مەبەستی سواڵکردن لەو شوێنانەی کە یاسادانەر دیاریی کردووە.

٨- سواڵکردن لە یاسای هەمواركراوی چاودێری نەوجەوانان ژمارە ٧٦ی ساڵی ١٩٨٣ جۆرێکە لە سەرگەردانی و بێلانەیی، ئەو ڕێوشوێنانەی لە مادەی ٢٦ی یاسای چاودێری نەوجەواناندا هاتووە فراوانتر و گشتگیرتر و کارپێکراوترن، لە دەقی مادەی ٢/٣٩٠ی یاسای سزادان.

٩- گەندەڵی حکومەت گەورەترین ڕۆڵی هەیە لە تەشەنەکردنی دیاردەی سواڵکردن و زۆری ژمارەی سواڵکەرەکان، ئەمەش بەهۆی کاریگەرییە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەکانیەوە.

١٠- قوربانی، لە تاوانی سواڵکردندا بە ڕەزامەندی خۆی پارە نادات، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا پارە دەدات بە سواڵکەرەکە دەشزانێت سواڵکەرەکە درۆ دەکات.

١١- ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان و برگە دەستوورییەکان ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕن لە چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی هەژاری و بێبەشی. ڕێزگرتن لە کەرامەتی مرۆڤ لە ڕێگەی دەقی دەستووری و ڕێککەوتنە نێودەوڵەتییەکان کە لەگەڵ دەوڵەتان ئەنجام دەدرێن.

١٢- وەزارەتی کار ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕێت لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەیسەکانی سواڵکردن لە ڕێگەی جێبەجێکردنی یاسای پاراستنی کۆمەڵایەتی

١٣- وەزارەتی ناوخۆ ئەرکی سەرەتایی هەیە لە مامەڵەکردن لەگەڵ حاڵەتەکانی سواڵکردن لە ڕێگەی جێبەجێکردنی یاسا و ئامادەکردنی وۆرک شۆپ و کۆنفرانس.

١٤- بۆمان ڕوون بووەوە، کە دووبارە گەڕانەوە بۆ تاوانکردن، وەک بارودۆخێکی توند، تاوانی سواڵکردن ناگرێتەوە.

١٥- یاسادانەری عێراق هەڵخەڵەتاندنی خەڵک بۆ سواڵکردن بە تاوان زانیووە، لەمەشدا کارێکی باشی کردووە، چونکە ڕەنگە گەورەکان لەلایەن باندە توندەکانەوە کۆنترۆڵ کرابێت

١٦- یاسادانەر پانتاییەکی زۆر بۆ ژماردنی شوێنەکانی سواڵکردن جێکردەوە، بە ئامانجی مامەڵەکردن لەگەڵ سواڵکردن بە هەموو شێوەکانییەوە، بە مەبەستی پاراستنی سەلیقەی گشتی.

دووەم: ڕاسپاردەکان

١- داوا لە یاسادانەر دەکەین، کە حاڵەتەکانی سواڵکردنی شاراوە لە ژێر پەردەی فرۆشتنی شتە بێ بایەخەکانی وەک کلینکس یان فرۆشتنی بنێشت بە تاوان بزانێت، ئەگەر بەڵگەکان ڕوون بن کە مەبەستی ئەم کردەوەیە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا سواڵکردنە.

٢- داوا لە یاسادانەر دەکەین سزاکە چڕتر بکاتەوە و دەقی مادەی ٣٩٠/١ لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراو، هەموار بکاتەوە و سزای تاوانی سواڵکردن لە هەر شوێنێک ڕوویدات بسەپێنێ، بەبێ دیاریکردنی شوێن.

٣- داوا لە یاسادانەر دەکەین دەست بەسەر ئەو پارەیەدا بگرێت، کە لەبەردەستی تاوانباری سواڵکەردایە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی ئەم پارەیە لە تاوانێکەوە بەدەست هاتووە.

٤- داوا لە یاسادانەر دەکات دەقی مادەی ١/٣٩٠ لە یاسای سزادانی هەموارکراوی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ هەموار بکاتەوە، کە تێیدا هاتووە: چوونە ژوورەوە بۆ ناو ماڵ یان پاشکۆکانی بەبێ مۆڵەت بێت، چونکە نەچوونە ناو ماڵەکان مافی تایبەتمەندی ئەو کەسەیە، کە یەکێکە لە گرنگترین مافەکان، کە بە مرۆڤ دەبەخشرێت، بۆیە داوا لە یاسادانەر دەکەین، کە زاراوەی خانوو لەناو چوارچێوەی شوێن لابەرێت، لە پێناو پیرۆزی شوێنی نیشتەجێبوونەکەدا، تاکو نەبێتە پاساوێک بۆ سواڵکەر لە پای سزایەکی کەم  پێشێلی ئەو پیرۆزییە نەکات، کە لەوانەیە چوونی بۆ ناو ماڵەکە بە ئامانج و مەبەستەکەی دزی یان تاوانی تر بێت، یاسادانەر کەیسێکی تایبەتی بۆ بڕیار بدات بۆ ئەو ژمارە زۆرەی سواڵکەر کە بە بیانووی سواڵکردن لە دەرگاکان دەدەن و دەچنە ناوماڵەکان، باند بن بۆ ڕفاندنی منداڵ یان باند بن بۆ دزیکردن.

٥- داوا لە یاسادانەر دەکەین دەقی مادەی ٢/٣٩٠ لە یاسای سزادانی عێراقی هەموارکراوی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ هەموار بکاتەوە کە بریتییە لە جێبەجێکردنی دەقی مادەی ٧٢ی یاسای هەموارکراوی چاودێری نەوجەوانان ژمارە ٧٦ی ساڵی ١٩٨٣ لەکاتێکدا نەوجەوان سواڵ دەکات، ئەو ڕووداوەی، کە نەوجەوانەکە سواڵکردن ئەنجام دەدات. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە سواڵکەری نەوجەوان  پێویستی بە پاراستن یان چاودێری هەیە، لە سواڵکردنیش تووشی مەترسی دەبێت، دۆخی سواڵکردن تەنها ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ ئەو مەترسییە کۆمەڵایەتییەی کە نەوجەوانەکە بەرکەوتەی دەبێت.

٦- داوا لە یاسادانەر دەکەین ناکۆکی نێوان دەقی مادەی ٣٩٠/٢ی یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراو و دەقی مادەی ٢٦ی یاسای چاودێری نەوجەوانان لاببات و مادەی ٢٦ بکاتە مادەی کارپێکراو بۆ ئەم پسپۆرییە.

٧- داوا لە یاسادانەر دەکەین بە پێی بڕگەکانی مادەی ٢٩ی یاسای نەوجەوانان بەرپرسیارێتی دایک و باوک کارا بکات.

٨- داوا لە یاسادانەر دەکەین دەقی مادەی ٣٠ی یاسای چاودێری نەوجەوانان بە شێوەیەک هەموار بکاتەوە، کە لەگەڵ دەقی مادەی ٣٩٢ بگونجێت، کە بە توندی سزای دایک و باوک و کەسانی تر دەدات، بەهۆی هاندان یان پاڵنانی نەوجەوان بەرەو سواڵکردن و ناکۆکی نێوان دەقی سەرەوە و دەقی یاسای سزادان، مادەی ٣٩٢ کە بە یاسا هەموار کراوەتەوە، هەڵبگرێت.

٩- داوا لە یاسادانەر دەکەین سزای تاوانی سواڵکردن توندتر بکاتەوە بە لەبەرچاوگرتنی زۆری حاڵەتەکانی سواڵکردن و بێزێزیکردن بە هەندێک لەم پیشەیە و بیکاتە تاوانی کەتن و مەرجی دووبارەبوونەوەی لەلایەن سواڵکەرانەوە، کە دەستگیر دەکرێن و بڕیاری دادوەری لە دژی دەردەچێت، بۆ ئەوەی دۆسیەی دووبارەبوونەوەی سزاکە، وەک بارودۆخێکی سەخت بۆ سزاکە بزانن.

١٠- داوا لە یاسادانەر دەکەین دەقی مادەی ١/٣٩٠ لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراوی عێراق، هەموار بکاتەوە و توندی سزاکە سنووردار بکات، بۆ ئەو تەنها کەسانە بگرێتەوە، کە خۆیان بە کەمئەندام یان بریندار پیشان دەدەن، یان فێڵ یان هەر شتێکی تر بەکاردەهێنن..

١١- داوا لە یاسادانەر دەکەین دەقی مادەی ١/٣٩٠ لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراوی عێراق

هەموار بکاتەوە و حاڵەتی سزای توند بۆ سواڵکەی منجرڵا بەرێت، سەختە پێوەرێک یان کۆنترۆڵێک هەبێت، کە ڕادە و بڕی منجرییەکە پێ دیاری بکرێت.

١٢- داوا لە یاسادانەر دەکەین دەقی مادەی ٣٩٠/١ لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراوی عێراق هەموار بکاتەوە و دۆسیەی سزای توند بە هۆی نیشاندانی کەمئەندامی یان برینێک هەڵبگرێت، بەهۆی ئەوەی ئەو کەسانێک هەنە بە راستەقینە تووشی ئەم کەمئەندامییە یان برینە بوونە، لەبەر ئەوەی زۆربەی کەمئەندامیەکان دیارن، هەربۆیە مەحاڵە بشاردرێنەوە، حکومەت پێویستە لەبری زیادکردنی سزاکە، چارەسەر و پاڵپشتیان بکات، لەبەرئەوەی کە یاسادانەر مامەڵەی لەگەڵ ئیستغلالکردنی کەمئەندامییەکە کردووە، لە سواڵکردن لە یاسای چاودێریکردنی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکانی ژمارە ٣٨ی ساڵی ٢٠١٣، مادەی ٢٢ی هەمان یاسا.

١٣- داوا لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن دەکەین لیژنە تایبەتەکان کارابکات، بۆ پاراستنی منداڵان، دابینکردنی هەموو ئامرازەکانی خۆپارێزی و چارەسەر بۆ سواڵکەری نەوجەوان، هەروەها دەسەڵاتی فراوانی هەبێت، لە داڕشتنی سیاسەتی گشتی و ڕووبەڕووبوونەوەی هەموو ئەو حاڵەتانەی کە نەوجەوان تووشی دێت.

١٤- داوا لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن دەکەین خانەی تایبەت دابمەزرێنێت، کە ئاگاداری سواڵکەرانی پێگەیشتوو بێت، هاوشێوەی ئەو خانانەی کە ئاگاداری نەوجەوانانی بێلانەن.

١٥- داوا لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن دەکەین، سزای جێگرەوە کارا بکات، لەوانەش دانان لە خانەکانی کارپێکردن، هەروەها چالاککردنی

ناوەندەکانی ڕاهێنانی پیشەیی بۆ ڕاکێشانی سواڵکەرەکان، بە مەبەستی فێرکردنی پیشەیەکی شەرەفمەندانە، کە بژێوی ژیانیان بۆ دابین بکات.

١٦- داوا لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن دەکەین، کە ڕۆڵی بەشی سواڵکەر و بێلانە لە وەزارەتی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی، بەشی چاودێری بۆ کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت کارا بکات و ڕۆڵی تەنها هەماهەنگی و دابینکردنی کادر و پێدانی دەسەڵاتی فراوان بێت بە بەڕێوەبەرایەتییەکە لە بابەتی پێکهێنانی لیژنە هاوبەشەکانی کار و ناوخۆ، هەروەها چڕکردنەوەی هەڵمەتەکان بۆ نەهێشتنی ئەم دیاردەیە.

١٧- داوا لە دەستەی ڕاگەیاندن دەکەین، لە ڕێگەی میدیای دەنگی و ڤیدیۆییەوە ڕۆڵی ڕاگەیاندن چالاک بکەن. بۆ مەبەستی دەرخستنی ئەم دیاردەیە بە ڕووی ڕاستەقینەی خۆی و پاڵنانی خەڵک بۆ ئەوەی نەبەخشێتە سواڵکەر، لە پێناو پاراستنی سەلیقەی گشتی.

١٨- داوا لە ئەنجوومەنی باڵای دادوەری دەکەین، دادوەرەکان ڕاسپێرێت، کە بێ پاساو هاوسۆزی سواڵکەر نەبن، هەروەها بەپێی بڕگەکانی یاسای سزادان سەبارەت بە سواڵکەرەکان بڕیار بدەن.

# ليستى سەرچاوەكان


القران الكريم

1- قانون الحماية الاجتماعية رقم 11 لسنة 2014 العراقي
2- قانون العقوبات المصري رقم 58 لسنة 1937
3- قانون التسول المصري رقم 43 لسنة1933
4- قانون الرعاية الاجتماعية رقم 126 لسنة 1980 العراقي
5- قانون العقوبات الأردني رقم 16 لسنة 1960 المعدل.
6- قانون العقوبات العراقي رقم 111 لسنة 1969 المعدل
7- قانون العقوبات المصري. رقم 58 لسنة 1937
8- قانون انضمام العراق إلى اتفاقية الأمم المتحدة لمكافحة الفساد لعام 2003 رقم 3 لسنة 2007
9- قانون أصول المحاكمات الجزائية العراقية رقم 23 لسنة 1971 المعدل
10- قانون تعديل الغرامات العراقي رقم 6 لسنة 2008 المعدل
11- قانون رعاية ذوي الإعاقة والاحتياجات الخاصة رقم 38 لسنة 2013 العراقي
12- قانون مكافحة الاتجار بالبشر العراقي رقم 28 لسنة 2012
13- قانون هيأة النزاهة العراقى رقم 30 لسنة 2011
14- احمد عبد القادر، جريمة الاتجار بالبشر دراسة مقارنة شركة العاتك، بيروت.
15- ادم سميان ذياب، جريمة التسول، رسالة ماجستير مقدمة الى كلية القانون، جامعة بغداد، سنة 2001.
16- اقبال الفلوجي, نحو سياسة جنائية حديثة مجلة العدالة العدد 1 لعام 1976.
17- الاتفاقية الأوربية لمكافحة الاتجار بالبشر لعام 2005 وبرتوكول منع وقمع ومعاقبة الوطنية الاتجار بالبشر وخاصة النساء والاطفال المكمل للاتفاقية الأمم المتحدة لمكافحة الجريمة المنظمة . عبر الوطنية عام 2000.
18- الشيخ احمد رضا، معجم متن اللغة، ج3، دار مكتبة للحياة، بيروت 1959، ص87.
19- امل حمدي دكاك, أثر الحروب والنزاعات المسلحة على الأسرة العربية مجلة جامعة دمشق المجلد 23.
20- امير فرج يوسف مكافحة الفساد الاداري والوظيفي وعلاقته بالجريمة على المستوى المحلي والإقليمي والدولي في ضل اتفاقية الأمم المتحدة لمكافحة الجريمة المكتب الجامعي الحديث الإسكندرية 2010.
21- بسيمة الحلفاوي، التسول في المغرب من الاباء الى الابناء، ط1، بدون مكان نشر 2006.
22- بن منظور، جمال الدين محمد بن مكرم لسان العرب, ج 6 ط 3 دار إحياء التراث العربي للنشر والتوزيع, بيروت 1999.

23- جعفر عبد الأمير الياسين التشرد وانحراف سلوك الصغار والأحداث في العراق دراسة ميدانيه في علم الاجتماع الجنائي رسالة دكتوراة جامعة بغداد كلية الآداب 2002.
24- د . توفيق الحاج, الحرب على الإرهاب, منشورات زين الحقوقية 2013؟
25- د احمد امين، شرح قانون العقوبات الأهلي ط3 المجلد الثالث, الدار العربية للموسوعات, بيروت, 1982, قانون العراق العام العراقي.
26- د جلال ثروت، نظم القسم العام قانون العقوبات نظرية الجريمة دار الجامعة الجديدة, الاسكندرية,2010.
27- د حكمت بشير, الحروب العدوانية وما أفرزته من قروض وتعويضات بحق العراق, الطبعة الأولى دار الزهراء للطباعة والنشر بيروت, 2009.
28- د طلال ابو عفيفة شرح قانون العقوبات القسم العام, دار الثقافة للنشر والتوزيع, عمان, 2012, الأردن.
29- د عدنان ياسين مصطفى ود كريم محمد حمزه، اطفال في نزاع مع القانون دراسة ضمن مشروع تعزيز الحماية والعدالة لأطفال والشباب في العراق, 2011.
30- د علي عبد القادر القهوجي شرح قانون العقوبات العام القسم العام نظرية الجريمة, منشورات الحلبي الحقوقية, بيروت, 2011.
31- د محمود نجيب حسني شرح قانون العقوبات القسم العام, ط3 دار النهضة العربية.
32- د نوري سعدون عبد العوامل الاجتماعية المؤثرة في ارتكاب الجريمة, مجلة جامعة الانبار للعلوم الانسانية العدد الاول, 2011.
33- د وصفي محمد علي الوجيز في الطب العدلي, العاتك لصناعة الكتب, القاهرة, 2010.
34- د. ابتسام علام الجماعات الهامشية دراسة انثروبولوجية لجماعات المتسولين في مدينة القاهرة طبعة 2002.
35- د. ابو حسن جاسم ذربة، جريمة الاستغلال الجنسى للأطفال في قانون العراقى والقوانين المقارنة، مكتبة القانون المقارن، بغداد، 2023.
36- د. احمد فتحي سرور الحق العام في الحياة الخاصة مجلة القانون والاقتصاد, العدد 45 1987.
37- د. اشرف توفيق شمس شرح قانون العقوبات / القسم العام النظرية العامة للجريمة والعقوبة 2012.
38- د. أيسر أنور علي و د آمال عثمان، أصول علم الإجرام والعقاب, ج 1, علم العقاب, دار النهضة العربية,1993.
39- د. تميم طاهر احمد، بدائل العقوبات السالبة للحرية قصيرة الأمد، رسالة ماجستير مقدمة إلى كلية القانون جامعة بغداد – 1988.
40- د. حسين الشيخ محمد طه الباليساني. جريمة التسول بحث منشور في جملة تەرازوو، يصدرها اتحاد حقوقي كردستان، العدد 32 و 33، سنة 2007.
41- د. دهام اكرم عمر، جريمة الاتجار بالبشر، دار الكتب القانونية، مصر القاهرة، 2011.

42- د. رندة الفخري الطفل والجريمة في ظل قانون الأحداث والقواعد الدولية دراسة مقارنة منشورات زين الحقوقية بيروت, 2014.
43- د. رؤوف عبيد جرائم الاعتداء على الأشخاص والأموال, دار النهضة العربية 1976.
44- د. رؤوف عبيد, شرح قانون العقوبات التكميلي الطبعة الخامسة دار الفكر العربي . 1979.
45- د. سعد خليفة العبار أحكام التسول فقها وقانونا مجلة البحوث القانونية جامعة مصراتة كلية قانون، عدد 1 السنة 2015.
46- د. شاكر سليمان محمود، الباعث واثره في المسؤلية الجنائية، اربيل مطبعة هيفى، 2023.
47- د. شاكر سليمان محمود و توانا جمال، حق الطفل العراقي في التعليم واثر التقدم التكنولوجي عليه، بحث منشور في مجلة جامعة تكريت للحقوق، سنة (5) العدد (1) جزء (2)، السنة 2020.
48- د. صابرين محمد، الباعث في القانون الجنائي، مكتبة الوفاء، مصر، الاسكندرية، 2011.
49- د. عبد الامير كاظم زاهد وقائع أبحاث مؤتمر و قوانين الأسرة العراقية المشكلات و المعالجات 2014.
50- د. عبد الخالق محمد عفيفي بناء الأسرة والمشكلات الأسرية المعاصرة المكتب الجامعي الحديث.2011.
51- د. عبد الرحمن توفيق احمد, شرح قانون العقوبات القسم الخاص, الجرائم الواقعة على الأشخاص ط1 دار الثقافة والنشر والتوزيع بدون مكان طبع 2012.
52- د. عبد الرحمن خلفي العقوبات البديلة دراسة فقهية تحليلية مقارنة ط 1 المؤسسة الحديثة للنشر لبنان 2015 .
53- د. عبدا لقادر القهوجي وفتوح عبد الله الشاذلي، علم الإجرام وعلم العقاب مطابع السعدي, 2007.
54- د. عصام العطية، قانون الدولي العام، الطبعة الخامسة بغداد 1992.
55- د. عصمت عدلي، الجريمة وقضايا السلوك الانحرافي بين الفهم والتحليل دار الجامعة الجديدة, الإسكندرية. 2009.
56- د. علي حسين خلف- د. سلطان عبد القادر الشاوي / المبادئ العامة في قانون العقوبات ط2, العاتك الصناعه الكتاب, القاهرة 2010.
57- د. على حمزة عسيل، د. نورس رشيد طه، الوجيز فى علم الاجرام، دار المسلة، بغدا، 2023.
58- د. عمار فوزي المياحي الفساد الإداري وسبل علاجه وفقا لتقديرات البيئة العراقية مجلة المستقبل العراق العدد 2008.
59- د. عمر السعيد رمضان دروس في علم الإجرام دار النهضة العربية للطباعة والنشر بيروت 1972.
60- د. فخري عبد الرزاق الحديثي شرح قانون العقوبات القسم الخاص 2 مطبعة الزمان 1996.

61- د. فخري عبد الرزاق الحديثي, شـرح قانون العقوبات القسـم العام، شـركة العاتك لصناعة الكتب، القاهرة، 2010.
62- د. فخري عبد الرزاق الحديثي، شـرح قانون العقوبات / القسـم الخاص مطبعة الزمان, بغداد, 1996.
63- د. فوزية عبد الستار, مبادئ علم الاجرام والعقاب, دار النهضة القاهرة 1972.
64- د. ماهر عبد شـويش، شـرح قانون العقوبات القسـم الخاص المكتبة القانونية بغداد. 2002.
65- د. متولي صالح شاكر تعريف الجريمة وأركانها من وجهة نظر مستحدثة دار الكتب القانونية القاهرة، السنة 2003.
66- د. محروس نصـار الهيتي, النتيجة الجرمية في قانون العقوبات الطبعة الأولى منشورات زين الحقوقية.2011.
67- د. محروس نصـار الهيتي، النظرية العامة للجرائم الاجتماعية, الطبعة الأولى منشورات زين الحقوقية 2011.
68- د. محمد صبحي نجم شرح قانون العقوبات / القسم العام النظرية العامة للجريمة دار الثقافة للتوزيع والنشر, عمان, 2008.
69- د. محمد عبد الحميد أبو زيد، سيادة الدستور وضمان تطبيقه - دار النهضة العربية القاهرة 1989.
70- د. محمد مختار القاضي الاتجار بالبشر, دار المعرفة الجامعية, 2011.
71- د. محمود محمد عباره، الفساد الإداري وعلاجه في الشريعة الإسلامية 1 دار الثقافة للنشر والتوزيع عمان 2011.
72- د. محمود نجيب -حسـني شـرح قانون العقوبات اللبناني القسـم العام -دار النهضـة العربية بيروت 1984.
73- د. محمود نجيب حسـني, أسـباب الإباحة في التشـريعات العربية النظرية العامة للإباحة من القاهرة 1962.
74- د. مدحت الديبسـي، محكمه الطفل والمعاملة الجنائية للأطفال دار الجامعة الجديدة الإسكندرية، 2002.
75- د. مكي عبد مجيد, الفسـاد المالي والإداري في العراق مجلة جامعة كربلاء المجلد السابع 2009.
76- د. نادية مصطفى حسين، المسؤولية الجنائية للتسول. دار المسلة بغداد، 2023.
77- د. نظام توفيق المجالي, شرح قانون العقوبات القسم العام دراسة تحليلية في النظرية العامة للجريمة والمسـؤولية الجزائية, ط3 دار الثقافة للنشـر والتوزيع الأردن 2010.
78- د. واثية السعدي, شرح قانون العقوبات القسم الخاص بغداد 1988.
79- د.احسـان المفرجي ود.كطرن زغير وحد رعد ناجي النظرية العامة في القانون الدستوري والنظام الدستوري في العراق ط4 شركة العاتك للنشر – 2011.
80- د.جمال إبراهيم الحيدري, أحكام المسؤولية الجزائية ط 1 منشورات زين الحقوقية, بغداد 2010.

81- د. صلاح البصيصي، المعاهدة الدولية والرقابة عليها في ظل الدستور العراقي الجديد مجلة العربي للعلوم الاقتصادية والإدارية العدد 1 2014.
82- د.ظافر احمد منديل، المواجهة الدستورية لظاهرة التسول في العراق، مجلة كلية قانون للعلوم القانونية، ، جامعة تكريت، مجلد 11، عدد 43، لعام 2023.
83- د.عبد الباسط محمد سيف الحكيمي . النظرية العامة للجرائم ذات الحظر العام الطبعة الأولى الدار العلمية الدولية للنشر, عمان, 2002.
84- د.عصام عبد الفتاح مطر، الفساد الإداري ماهيته أسبابه ومظاهره دار الجامعة الجديدةالاسكندرية, 2011.
85- د.فخري عبد الرزاق, الحديثي د. خالد حميدي ,الزغبي شرح قانون العقوبات القسم الخاص الجرائم الواقعة .على الاموال دار الثقافة والنشر والتوزيع 2009.
86- د. نعمان عطا الله الهيتي - الرقابة على الحكومة دراسة دستورية مقارنة - الطبعة الأولى دار رسلان للطباعة والنشر .سوريا- دمشق – 2007.
87- رضا إسماعيل ظاهرة, التسول ودور الشرطة في مكافحتها, القاهرة, 1980.
88- رؤى نزار امين، الركن المعنوي وإثباته في الجرائم الشكلية دراسة مقارنة رسالة ماجستير مقدمة إلى معهد العلمين للدراسات العليا 2016.
89- سحر خليل محمود حقوق الطفل في الاسلام و الاتفاقيات الدولية دراسة مقارنة رسالة ماجستير جامعة النجاح الوطنية كلية الحقوق, 2004.
90- سعد الخليفة الخبار، احكام التسول فقها وقانونا، مجلة بحوث القانونية، جامعة مصراته، كلية القانون، عدد1، السنة 2015.
91- صلاح محمد محمود, النظام القانوني لحماية الأطفال المقاتلين في القانون الدولي الإنساني, دراسة الحالة في إفريقيا, مطبعة الفضيل, 2011.
92- عبد الخالق النواوي, جرائم الجرح والضرب في الشريعة الإسلامية والقانون الوضعي, منشورات المكتبة العصرية, بيروت.
93- عبد الله سهو الناصر, التسرب من التعليم الطريق المفتوح نحو عمل الاطفال, عمان 2014.
94- عمر بن حكمت بن بشير, البطالة منهج التربية الإسلامية في معالجتها, رسالة ماجستير, الجامعة الإسلامية, الرياض, 2012.
95- غصن مناحي خيون, جريمة الاتجار بالبشر في التشريع العراقي والمقارن, رسالة ماجستير, كلية القانون والعلوم السياسية, جامعة البصرة 2012.
96- قاضي ازاد حيدر باوه، المواجهة الجنائية لظاهرة التسول في اقليم كردستان، بحث مقدم الى مجلس قضاء في اقليم كردستان العراق، 2021".
97- محمد ابراهيم فلاحى، المكان كظرف مشدد لجريمة السرقة، فى قانون العقوبات العراقى والقضاء، مكتبة صباح، بغداد، 2021.
98- محمد عبد اللطيف, فرج شرح قانون العقوبات القسم العام النظرية العامة للعقوبة والتدابير "مطابع الشرطة للنشر والتوزيع 2012.
99- محمدي حمزة التسرب, المدرسي رسالة ماجستير مقدمة إلى جامعة أبي بكر في الجزائر كلية العلوم قسم علم الاجتماع 2015.

100- منال فتحى عنبتاوي، تقييم برنامج مكافحة ظاهرة التســـول من قبل وزارة التنمية الاجتماعية الاردنية خلال فترة من 1996 لغاية 2001، رســالة ماجســتير في علم الاجتماع كلية دراسات الجامعة الادرنية، 2004.
101- مهدي الســـعيد، دور الخدمة الاجتماعية في الحد أو التخفيف من ظاهره تشـــرد الأحداث رســالة ماجســتير مقدمة إلى جامعة محمد بو ضــايف كلية الأداب والعلوم الاجتماعية قسم علم الاجتماع 2005.

# التنظيم القانوني لجريمة التسول

## في قانون العقوبات العراقي

(( دراسة قانونية ))







بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردن (٥٩٢) ساڵی ٢٠٢٣ی پێدرراوە

چاپخانەی هێڤی / هەولێر